بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين . وبعد .

---

هنديكه هەیڤا ڕەمەزانێیە، هەیڤەكا خۆدان قەدره ل دەڤ خۆدێ، و قورئانا پیروز یا د شەڤەكا ڤێ هەیڤێدا هاتیه خۆارێ ل سەر پێغەمبەری سلاڤ لێ بن، و خۆدێ دەرهەقێ وێ شەڤێدا یا گوتی (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣) تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ (٤) سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ (٥) ) سورة القدر .

وهەیڤا ڕەمەزانێ هەیڤا قورئانێیە و هەیڤا ڕۆژی گرتنێیە، و د ڤێ هەیڤێدا شەیتان د هێنە گرێدان، و مرۆڤێن موسلمان د ڤێ هەیڤێدا گەلەك عیبادەتی بۆ خۆدێ دكەن، و خۆ نیزیكی خۆدێ دكەن ب دانا سەدەقا ل سەر فەقیرو هەژاران .

بەلێ گەلەك موسلمان نە د شارەزانە د ئەحكامێن هەیڤا ڕەمەزانێدا، ڤێجا ژبەر ڤێ چەندێ من هەولدا كو ئەز ڕابم بۆ برایێن خۆ ئەڤان لاپەران كوم كەم و وەرگێرمە زمانێ كوردی؛ دا بۆ برایێن خۆ ئەحكامێن هەیڤا ڕەمەزانێ دیاركەم چونكۆ گەلەك ژ برایێن مە د زمانێ عەربیدا نە د شارەزانە، و هەروەسا من چەند فەتویێن گرنگ یێن فەقییێ ڤی چەرخی (ابن عثيمين)



یێن وەرگێراینە بۆ زمانی كوردی، دا تۆ پتر مفای ژ ڤان لاپەران بكەی .

وهەروەسا من بۆ برایێن خۆ چەند پروژێن خێرێن مەزن د هەیڤا ڕەمەزانێدا یێن وەرگێراین بۆ زمانێ دەیكینییێ؛ دا برایێن من یێن خۆشتڤی وان خێرێن مەزن ب

دەستێن خۆ ڤە بینن و هەروەسا ببیتە دەرگەهەك بۆ وانا بۆ چوونا بەهشتێ.

ول دووماهییێ برا من چەند شیرەتێن مرۆڤێن زانا بۆ برایێ خۆ یێن وەرگێراین دا تۆ مفای ژێبكەی و خۆ ژوان خەلەتیان دویر بێخی، دا تۆ پتر موستەحەقێ دولوڤانییا خودێ ببی .

وصلى الله على نبينا محمد و على آله وصحبه وسلم

حەژێكەرێ تە بۆ خۆدێ /

أبو بكر كوچر

٢٠١٠م / ١٤٣٢هـ

# ئەحکامێن هیڤا ڕەمەزانێ



<u>ڕامانا ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێ چیە :</u>

هێلاتنا خۆرانێ و ڤەخۆارنێ و چوونا نڤینا ژنکێیە ژ دەستپێکا سپێدێ ( الفجر ) هەتا ڕۆژ ئاڤابیت، د هەمی ڕۆژێن ڕەمەزانێدا؛ دا مرۆڤ خۆ بێ نیزیکێ خۆدێ بکەت .

<u>حوکمێ ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێ :</u>

ڕۆژی گرتنا ڕەمەزانێ فەرزە (فرض) ل سەر موسلمانێ گەهشتی ( البالغ ) و یێ ب عاقل بیت و بشێت ڕۆژیان بگریت زەلام بیت یان ژن بیت، و ڕوکنێ چارێیە ژ ڕوکنێن ئیسلامێ ژبەر گوتنا خۆدێ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) (البقرة ١٨٣ ) ئانکۆ: گەلی خۆدان باوەرا ڕۆژی گرتن یا ل سەر هەوە هاتیە فەرزکرن و نڤێسین کا چەوا ل سەر مللەتێن بەری هەوە هاتیە فەرزکرن و نڤێسین ژبەرکو دا هوین تەقوا خۆدێ بکەن.

<u>مەرجێن ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێ :</u>

١- ئیسلام : ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر مرۆڤێ کافر هەتا موسلمان بیت .

٢- عەقل : ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر مرۆڤێ دین (مجنون) هەتا ب عاقل کەڤیت .

٣- گەهشتن ( البلوغ ) : ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر بچویکی هەتا ب گەهیت (بالغ) ، بەلێ دێ هێتە

فەرماندان کو ڕۆژییان بگریت ئەگەر بشێت؛ دا فێری ڕۆژی گرتنێ بیت .

٤- شیان ل سەر ڕۆژی گرتنێ : ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر مرۆڤێ شیان نەبن؛ ژبەر مەزنییێ یان ژبەر نەخۆشیەکا کو بێ هیڤی ژ ساخبینا وی، و دێ پێش هەر ڕۆژەکێڤە مسکینەکێ تێرکەت . ( مرۆڤێ مسکین ئەوە ئەوێ چ ل مال نەی)

٥- جێوازکرن : ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر بچویکی هەتا جیوازی ل دەڤ پەیدابیت ، ومەرەم ژ جێوازییێ ئەوە کو بچویك مەزن بیت و جێوازییێ بکەت کو ڕۆژییێ بۆ چی دگریت .

٦- ڕاوستاندنا خوینا ژڤانی : ڕۆژی گرتن ژ ژنکێ ناهێنە قەبولکرن هەتا خوینا وێ یا ژڤانی ب ڕاوستیت

٧- ڕاوستاندنا خوینا نیفاسێ : ڕۆژی گرتن ژ ژنکێ ناهێتە قەبولکرن هەتا خوینا وێ یا نیفاسێ ب ڕاوستیت. و خوینا نیفاسێ ئەو خوینەیە ئەوا ژنك دبینیت دەمێ بچویك بوونێ .

٨- ئینیەت : دڤێت مرۆڤ ئینیەتا خۆ ب شەڤ بینیت؛ چونکۆ ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێ نا چێبیت بێ ئینیەت، و ئینیەت جهێ وێ د دلیدایە . بەلێ ئەگەر مرۆڤی ڤییا ڕۆژیەکا سوننەت بگریت ل وی دەمی نە ئەرکە ل سەر مرۆڤی ئیلا مرۆڤ ئینیەتا خۆ ب شەڤ بینیت .



سوننەتێن ڕۆژی گرتنێ :

١- مرۆڤ پاشیڤێ درەنگی بخۆت، ئانکۆ بەری نڤێژا سپێدێ ب دەمەکێ وەسا کو مرۆڤ بزانیت دێ گەهیتە پاشیڤێ خۆت بەری بانگێ سپێدێ بهێتە دان .

٢- لەزکرن ل فتارێ ئەگەر بزانیت ڕۆژ ئاڤابوو .

٣- مرۆڤ گەلەك خێرا بکەت و گەلەك نڤێژێن سوننەت بۆ خۆ بکەت و قورئانێ گەلەك بخوینیت چونکۆ هەیڤا ڕەمەزانێ هەیڤا خواندنا قورئانێیە، و مرۆڤ گەلەك زکرێ خودێ بکەت، و دووعا ئازاکرنا ژ ئاگری ژ خودێ بکەت، و هەروەسا مرۆڤ گەلەك دووعا ژ خودێ بکەت کو گونەهێن مرۆڤی ژێبەت .

٤- ئەگەر ئێکێ ئاخفتنەکا شکەستی گوتە مرۆڤی دڤێت مرۆڤ بێژیتێ ئەز مرۆڤەکێ ب ڕۆژی مە، دا مرۆڤ خێرەکا مەزن ب دەستێن خۆڤە بینیت .

٥- دووعا کرن ل دەمێ خوارنا فتارێ /

( اللهم لك صمت و على رزقك أفطرت ، فتقبل مني إنك أنت السميع العليم ) .

٦- فتارێ مرۆڤ ب چەند قەسپان بکەت، ئەگەر نەبن ب چەند خورما بکەت، ئەگەر نەبن ب چەند قورچێن ئاڤێ بکەت .

**چەند مرۆڤان هەق هەیە کو رۆژییێ بخۆن :**

**١- مرۆڤێ نەخۆش، کو رۆژی گرتن بۆ وی نەباشە بیت ژبەر ساخلەمییا وی، و مرۆڤێ وەغەرکری، ئەگەر ئەڤ هەردوو جورە مرۆڤە رۆژییێ بخۆن بۆ وان چێترە، و ئەگەر ب رۆژی بن ژی رۆژییا وان دروستە .**

**٢- ژنکا خۆینا ژڤانی یان خۆینا نیفاسێ ببینیت دێ رۆژییا خۆ خۆت و دێ وان رۆژێن خۆاری ئەداکەت، و ئەگەر ژنکێ خۆینا ژڤانی یان خۆینا نیفاسێ دیت و ب رۆژیبیت رۆژییا وی نەیا دروستە و ژێ ناهێتە قەبولکرن .**

**٣- ژنکا بحال یان ژی یاشیرمێهت ئەگەر ژ جانێ خۆ ترسیا یان ژی ژجانێ بچویکێ خۆ ترسیا دێ رۆژییا خۆ خۆت و پێش هەر رۆژییەکا بخۆت دێ خۆارنەکێ دەتە مرۆڤەکێ دەستکورت چ ل مالێ نە و دێ وان رۆژیێن خۆاری ئەداکەت، و ئەگەر وێ رۆژییێن خۆ گرتن و نەخۆارن ل وی دەمی رۆژییێن وێ دروستن .**

**٤- مرۆڤێ شیان نەبن بۆ گرتنا رۆژییان ڤێجا چ ژبەر مەزنییێ بیت یان ژی نەخۆشیەکا وەسا بیت کو بێ هیڤی بیت ژ ساخ بوونا خۆ، ئەڤ هەردوو جورە مرۆڤە دێ رۆژییان خۆ خۆن و پێش هەر رۆژەکا بخۆن دێ خۆارنەکێ دەنە مرۆڤەکێ مسکین، ئەو ژی نیف (صاعة) کو دبیتە کیلو و نیف .**



**خۆدێ چەند سالوخەت یێن داینە هەیڤا رەمەزانێ ئەو ژی ئەڤەنە :**

**١- بهێنا دەڤێ مرۆڤێ رۆژی گر پاقژ و خۆشترە ل دەڤ خۆدێ ژ بهێنا مسکێ .**

**٢- مەلائیکەت بۆ مرۆڤێن رۆژی گر دووعا ژێبرنا گونەهان دکەن هەتا رۆژی گر فتارێ بکەت .**

**٣- خۆدێ هەر رۆژ بەهشتێ دخەملینیت، و دبێژیت نیزیکە عەبدێن من یێن چاك دونیایێ بهێلن و بێنە بەهشتێ . یارب تۆ ب ناڤێن خۆ یێن پیروز کەی تۆ مە ژوان حیسابکەی آمین .**

**٤- ل هەیڤا رەمەزانێ شەیتان د هێنە گرێدان.**

**٥- دەرگەهێن بەهشتێ د هێنە ڤەکرن، و دەرگەهێن ئاگری د هێنە گرتن .**

**٦- شەڤا ( لیلة القدر ) یا تێدا هەی، کو خێرا عیبادەتێ وێ شەڤێ ژ خێرا عیبادەتێ هزار هەیڤان پترە، و ئەو کەسێ بهێتە بێ بارکرن ژ خێرا وێ ئەو ژ خێرەکا مەزن هاتە بێ بارکرن . یارب تۆ ب رزقێ مە بکەی آمین .**

**٧- ل شەڤا دووماهییێ ژ هەیڤا رەمەزانێ گونەهێن رۆژی گرا د هێنە ژێبرن .**

**ئەو کارێن دبنە ئەرك یان د هێنە دوپاتکرن کو مرۆڤ د هەیڤا رەمەزانێدا بکەت :**

**١- رۆژی گرتن : پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( کل عمل ابن آدم له ، الحسنة بعشر أمثالها إلی سبعمائة**

ضعف ، يقول الله عز وجل : إلا الصوم فإنه لي وأنا أجزي به ، ترك شهوته وطعامه وشرابه من أجلي . للصائم فرحتان : فرحة فطره وفرحة عند لقاء ربه ، ولخلوف فم الصائم أطيب عند الله من ريح المسك ) ئەڤ حەدیسە ژ ڤەگۆهاستنا ئیمامێ بوخاری وموسلمی یە .

هەمی کارێ کورێ ئادەمی بۆ ویە، و هەر خێرەك ب دەه خێرانە هەتا حەفت سەد جاران، خۆدێ دبێژیت : رۆژی گرتن تێ نەبیت بۆ منە و ئەز دێ جزایێ وی دەمێ، شەهوەتا خۆ دگەل خوارن و ڤەخوارنا خۆ بۆ من هێلا، رۆژی گری دوو کەیفێن هەین : کەیفەك دەمێ فتارا خۆ دکەت، و کەیفەك دەمێ دچیتە دەڤ خۆدێ، و بهێنا دەڤێ رۆژی گری ل دەڤ خۆدێ پاقژ و خۆشترە ژ بهێنا مسکێ . بەلێ ئەڤ خێرا مەزن نە بۆ وی کەسییە یێ کو بەس خوارنێ و ڤەخوارنێ بهێلیت چونکۆ پێغەمبەر سلاڤ لێ بن یا گوتی : (مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی (١٧٧٠) ئانکۆ: ئەوکەسێ گوتنا درەو وکارکرنێ پێ نەهێلیت خۆدێ چ ئیرادە ب هێلانا وی بۆ خوارنێ و ڤەخوارنێ نینە، وگوتنا ( فليس لله حاجة ) مەجازە و راماناوێ خۆدێ رۆژیبا وی قەبول ناکەت، وئەڤ چەندە ژ بابەتێ هشیارکرنێیە بۆ مرۆڤێ موسلمان دا نەکەڤیتە د گوننەهەکا مەزندا ئەو ژی ( قول الزور )ە .



و هەروەسا پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت (لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ فَقَطْ إنمَّا الصِّيَامُ مِنَ اللَغْوِ وَالرَّفَثِ فَإِنْ سَابَكَ أَحَدٌ أَوْ جَهِلَ عَلَيْكَ فَقُلْ إِنِّي صَائِم ) ئیمامێ بەیهەقی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی د-السنن الكبرى للبيهقي-دا (٤ /٢٧٠) ئانکۆ : رۆژی گرتن نە بەس هێلانا خوارنێ و ڤەخوارنێیە بەلێ رۆژی گرتن هێلانا گوتنا بێ مفا و گوتنا کرێتە ( ئاخفتنا شکەستی ) و ئەگەر ئێکێ گوتنەکا کرێت دەرحەقێ تەدا گوت یان ژی ژ نەزانینا خۆ زیانەك گەهاندە تە بێژێ ئەز مرۆڤەکێ ب رۆژی مە . ڤێجا موسلمان دەمێ تۆ ب رۆژی بی بلا ئەزمان و چاڤ و گوهێن تە و هەمی ئەندامێن لەشێ تە ب رۆژی بن .

**٢- ئەنجامدانا تەراویحان دگەل ئیمامی :** پێغەمبەری سلاڤ لێ بن دبێژیت : (من قام رمضان إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه ) ئیمامێ بوخاری و موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . ئەو کەسێ تەراویحان ل رەمەزانێ بکەت ژ باوەری و بۆ خۆ خێرا وان حیسابکەت، دێ گوننەهێن وی هەمی هێنە ژێبرن، و ئەڤ خێرە گەلەك یا مەزنە ڤێجا یا فەر ئەوە موسلمان ڤێ خێرێ ژ دەستێن خۆ نەکەت، وتەراویحان ب تەمامی دگەل ئیمامی بکەت، و پێغەمبەری سلاڤ لێ بن د حەدیسەکا دی ژێدا خێرا کرنا تەراویحان دگەل ئیمامی دیار دکەت و دبێژیت : ( من قام مع إمامه حتى ينصرف كتب له قيام ليلة ) خودانێن سونەنا ئەڤ

حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . ئەو کەسێ نڤێژێ و تەراویحان دگەل ئیمامی بکەت هەتا ب دووماهی دهێن و ئیمام ڕادبیت، خۆدێ دێ خێرا ڕابوونا شەڤەکا عیبادەتی بۆ نڤێسیت . ڤێجا برا بلا تۆ یێ هشیار بی کو تۆ ڤان تەراویحان ژ دەستێن خۆ نەکەی، و خۆ ژ ڤێ خێرا مەزن بێ بار نەکەی، چونکۆ مرۆڤ نزانیت ئەگەر مرۆڤی تەراویح کرن د ڤێ هەیڤێدا خۆدێ ژی گوننەهێن مرۆڤی هەمییان ژێبەت . و برا بینە پێش چاڤێن خۆ کا تە چەند گوننەهـ هەنە!! ئەرێ مانە دەلیڤا عەمرێ مرۆڤییە کو خۆدێ هەمی گوننەهان بۆ مرۆڤی ژێبەت . ئەز ب خۆدێ کەم مرۆڤێ خۆسارەت ئەوە یێ کو ڕەمەزان سەردا بهێت و ئەو عیبادەتەکا وەسا نەکەت کو گوننەهێن وی بهێنە ژێبرن .

٣- <u>دانا خێرا ( سەدەقە ) :</u> پێغەمبەر سلاڤ لێ بن گەلەك یێ مەرد بوو و تایبەتی د هەیڤا ڕەمەزانێدا، چونکۆ ئەو بوو - دای و بابێ من گوری بن- ئەوێ گوتی : ( أفضل الصدقة في رمضان ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . باشترین خێر ( سەدەقە ) ئەوە ئەوا د هەیڤا ڕەمەزانێدا دهێتە دان . ئەوێ خێرێ ژی گەلەك جۆر یێن هەین : -

أ- <u>خۆارنێ ب دەتە خەلکی :</u> خۆدێ دبێژیت : (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا (٩) إِنَّا نَخَافُ مِنْ رَبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا (١٠)



فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا (١١) وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيرًا (١٢) ) سورة الانسان . و ئەو خۆارنا ئەو حەژێ دکەن و هەوجە، د دەنە هەژار و سێوی و دیلان (٨). دبێژنە وان بۆ نکارێ خۆدێ ئەم ڤێ خۆارنێ د دەینە هەوە، مە چوو بەرانبەر ژ هەوە نەڤێت، نە خەلات و نە شوکورداری (٩) . ئەم ڤێ چەندێ دکەین چونکی ئەم ژ خۆداییێ خۆ د ترسین، دا مە ژ ڕۆژەکا ترش و تەحل و گران ب پارێزیت ( ١٠ ) . ژ بەر باشییا وان، خۆدێ ئەو ژ نەخۆشی یا وێ ڕۆژێ پاراستن، و روناهی و گەشاتی ئێخستە د سەر و چاڤێن واندا (١١) . و ژبەر بێنفرەهییا وان، ب بەهەشتێ و ئارمیشی خەلاتکرن .

و پێش چوویێن ڤێ ئوممەتێ دانا خۆارنێ ژ دەستێن خۆ نەدکرن، گەلەك ژ وان خۆدێ ژ وان رازیبیت خۆارن دا خەلکی ڤێجا چ ئەو خەلکە فەقیر بان یان هندەك مرۆڤێن برسی بان؛ چونکۆ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن یا گوتی : ( أيما مؤمن أطعم مؤمناً على جوع ، أطعمه الله من ثمار الجنَّة ، ومن سقى مؤمناً سقاه الله من الرحيق المختوم ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی. هەر موسلمانەکێ خۆارنەکێ بدەتە موسلمانەکێ برسی، خۆدێ دێ خۆارنەکێ ژ فێقیییێ بەهشتێ دەتێ، و ئەو کەسێ ئاڤێ بدەتە مورڤەکێ موسلمان خۆدێ دێ ئاڤێ ژ مەیکا سەرمۆر دەتێ . ڤێجا ژبەر ڤێ خێرا مەزن گەلەك جاران دا بینی پێش چوویێن ڤێ ئوممەتێ دا

خۆارنێ دەنە برایێن خۆ یێن موسلمان و دا ئەو ب دەستێن خۆ خزمەتا وان کەن وەکو (حسن البصری و عبد الله المبارك) وگەلەکێن دی ژی .

ب- فتارێ بدەتە مرۆڤێن رۆژی گر : پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( من أفطر صائماً كان له مثل أجره غير أنه لا ينقص من أجر الصائم شيء ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . ئەو کەسێ فتارێ بدەتە مرۆڤێ رۆژی گر خێرا وی وەکو خێرا مرۆڤێ رۆژی گرە، بەلێ چ ژ خێرا مرۆڤێ رۆژی گر کێم نابیت .

٤- خۆاندنا قورئانا پیروز : برایێ موسلمان قورئانێ گەلەك بخۆینە چونکۆ خێرا وێ گەلەکە پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ئەو کەسێ پیتەکێ ژ قورئانێ بخۆینیت ب دەهـ خێرانە، و ئەز نابێژمە هەوە ( ألم ) پیتەکە، بەلێ ( ألف ) پیتەکە و ( لام ) پیتەکە و ( میم ) پیتەکە . برا بزانە خۆاندنا قورئانێ د هەیڤا ڕەمەزانێدا بخێر ترە، ژ غەیرێ هەیڤا ڕەمەزانێ. ڤێجا گەلەك هەولبدە کو تۆ گەلەك قورئانێ بخۆینی ، و هەروەسا برا بلا خۆاندنا تە کارتێکرنێ ل سەر تە و ڕەوشتێ تە بکەت، ئانکۆ قورئانێ بخۆینە و هزرا خۆ تێدا بکەت دا تۆ بکەیە گری، بابێ هورەیرە خۆدێ ژێ رازیبیت دبێژیت دەمی ئەڤ هەردوو ئایەتە هاتنە خۆارێ ( أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ (٥٩) وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ (٦٠) ) سورة النجم . ئەهلێ سوففێ ( أهل الصفة ) کرنە گری هەتا روندك ل سەر روی یێن وان هاتنە خۆارێ، و



دەمێ پێغەمبەری سلاڤ لێ گوهـ ل گریا وان بووی ئەوی ژی کرە گری سلاڤ لێ بن، پشتی هینگێ سەحابا ژی کرە گری، پشتی هینگێ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت ( لا يلج النار من بكى من خشية الله ) ئیمامێ تورمزی و بەیهەقی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . ئانکۆ ناچیتە ئاگری ئەو کەسێ بکەتە گری ژ ترسێن خۆدێدا

٥- روینشتن ل مزگەفتێ هەتا رۆژ هەلات بیت :
پێغەمبەر سلاڤ لێ بن ئەگەر نڤێژا خۆ یا سپێدێ کربا دا مینیتە د مزگەفتێ ڤە هەتا رۆژ هلات بیا (ئەڤ حەدیسە یا هاتیە ڤەگۆهاستن د سەحیحا موسلمی دا) . و ئەنس خۆدێ ژێ رازیبیت گوت : پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ( من صلى الفجر في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ، ثم صلى ركعتين كان له كأجر حجة و عمرة تامة تامة تامة ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری د- السلسلة الصحيحة -دا .

ئەو کەسێ نڤێژا سپێدێ ب جەماعەت بکەت ل مزکەفتێ، پشتی هینگێ بروینیتە خۆارێ و زکرێ خۆدێ بکەت هەتا هەتاڤ بهەلیت، و پشتی هینگێ دوو ڕەکعەتان بکەت ( صلاة الضحى ) دێ بۆ وی هێتە حیسابکرن ب خێرا حەجەکێ و عومرەکێ ب تەمامی ب تەمامی ب تەمامی . و ئەڤ چەندە بۆ هەمی ڕۆژان، برا ئەگەر ئەڤ چەندە د هەیڤا ڕەمەزانێدا بیت دێ یا چەوابیت و هەر وەکو ئەم دزانن کو ڕۆژێن

هەیڤا ڕەمەزانێ ڕۆژێن دلوڤانییێ نە !! برا باش هزرا خۆ بکە خێرا حەججێ و عومرێ نە بیچەکە !!!

٦- خۆ زیندانکرن ژ بۆ عیبادەتی ( الاعتكاف ) :

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هەر سال دا دەه ڕۆژان ئیعتیکافێ کەت، و ل سالا مرن سەردا هاتی بیست ڕۆژان ئیعتیکاف کر . ( ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی )

٧- عومرە د ڕەمەزانێدا : یاهاتیە ڤەگۆهاستن ژ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن کو خێرا عومرێ د هەیڤا ڕەمەزانێدا ب خێرا حەججەکێیە. ( ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی )

٨- رابوونا شەڤا ( ليلة القدر) : خۆدێ دبێژیت ( إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ (١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ (٢) لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ (٣) ) سورة القدر . مە قورئان د شەڤەکا ب رێز و رویمەتدا ئینا خوارێ، تۆ چ دزانی ئەو شەڤا ب رێز و رویمەت چ شەڤە، ساخکرنا وێ شەڤێ ب رێکا پەرستنا خۆدێ چێترە ژ هزار هەیڤان . و پێغەمبەری سلاڤ لێ بن یا گوتی : ( من قام ليلة القدر إيماناً واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی . ئەو کەسێ رابیتە شەڤا ( ليلة القدر ) ب باوەری و حیسبکەت خێرا وێ بۆ خۆ، دێ گوننەهێن وی هەمی هێنە ژێبرن . ژبەر ڤێ خێرا مەزن پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بزاڤ دکر کو ئەڤ شەڤە ژێ نەچیت و هەروەسا



سەحابان ژی بزاڤ دکر ژبەر گرتنا ڤێ شەڤێ، و عائیشا دەیکا مە موسلمانا خۆدێ ژێ رازیبیت گوتە پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ئەگەر ئەز رابومە شەڤا ( ليلة القدر ) ئەز چ بێژم، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوتێ بێژە ( اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عني ) ) ئیمامێ ئەحمەد ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی .

٩- گوتنا زکری و دووعاکرن و کێشانا ئیستغفاران ب گەلەکی : موسلمان بۆ خۆ گەلەك زکری بێژە و هەروەسا دووعا بکە و گەلەك ئیستغفاران بکە چونکۆ دەمێ ڕەمەزانێ دەمەکێ پیروزە، و ڤێجا ب تایبەت ل وان دەمان ئەوێن دووعا ل دهێنە قەبولکرن وەکو : -

أ- دەمێ فتارەکرنێ : مرۆڤێ برۆژی دووعایەکا هەی ل دەمێ فتارەکرنێ ناهیتە زڤراندن .

ب- سێکا دووماهییێ ژ شەڤێ : خۆدایێ مەزن دهیتە ئەسمانێ دونیایێ و دێ بێژیت : ئێك هەیە هەوجەهی یەك هەیە دا ئەز بدەمێ ، ئێك هەیە داخۆازا ژێبرنا گوننەهان دکەت دا ئەز گوننەهێن وی ژێبەم .

ج- ئیستغفار کێشان بەری سپێدێ : خۆدێ دبێژیت ( وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ) سورة الذاريات الآية ١٨ . و بەری سپێدەیان داخۆازا ژێبرنا گوننەهان ژ خۆدێ دکەن .

د- دەمژمێرێ دووعان دهێنە قەبولکرن ل ڕۆژا خۆتبێ، و زانا دبێژن ئەو دەمژمێرە ژی دەمژمێرێ دووماهییێیە ژ ڕۆژا خۆتبێ .

**هشیار کرن ژ چەند خەلەتیان کو مرۆڤێ موسلمان خۆ ژێ دویر بێخیت د دەمێ رۆژی گرتنێدا :**

١- مرۆڤ ب شەڤێ هەمییێ مینیتە هشیار و ب رۆژێ بنڤیت .

٢- نەکرنا چەند نڤێژێن فەرز ب ئەگەرێ نڤستنێ .

٣- ئیسراف کرن د خوارنێ و ڤەخوارنێدا .

٤- هاژوتنا ترومبێلێ ب لەز هێجەتا هندێ کو مرۆڤ یێ عاجزە و وەستیایە ب ئەگەرێ رۆژی گرتنێ .

٥- مرۆڤ وەختی ژدەست بدەت ب سەحکرنا فلمان وزنجیرانڤە وهەر پروگرامەکێ بێ مفا .

٦- خوارنا پاشیڤێ ب دەمەکێ زوی، و پشتی هینگێ بنڤیت و نڤێژا سپێدێ نەکەت .

٧- نەکرنا نڤێژێن تەراویحان ب تەمامی دگەل ئیمامی ل مزگەفتێ .

٨- هاژوتنا ترومبێلێ ب لەزکرنەکا گەلەك ب هێجەتا هندێ کو دا بگەهیتە فتارێ .

٩- رووینشتنا جحێلان ل سەر جادان وکرنا گوننەهان، بگرە ژ غەیبەتێ یان ئاخفتنێن شکەستی .

١٠- کومبون د دەمێ دەوامێدا و غەیبەتکرنا خەلکی یان ژی گێراندنا ئاخفتنان د ناڤبەرا موسلماناندا .

١١- دڤێت مرۆڤێ رۆژی گر ب رۆژی بیت ب باوەری و هەروەسا خێرا وێ بۆ خۆ حیسابکەت ل دەڤ خۆدێ .



١٢- بوراندنا ژنکێ باراپتر ژ دەمێ خۆ ب چێکرنا خوارنێڤە .

١٣- گەلەك جاران مرۆڤێ رۆژی گر دێ خوین ژ دفنا وی هێت یان دێ هەلاڤێژیت یان دێ ئاڤێ ڤەخۆت و هەر تشتەکێ دی کو دێ چیتە د گەوریيا ویدا نە ب مەرەما وی، ئەڤ هەمییە رۆژی پێ ناکەڤیت ئەگەر نە ب مەرەما مرۆڤی بیت .

١٤- دروستە مرۆڤێ رۆژی گر ئینیەتا خۆ بینیت بۆ رۆژی گرتنێ و ئەو یێ ب جەنابەت و پشتی نڤێژا سپێدێ سەرێ خۆ بشۆت و نڤێژا خۆ بکە، و هەروەسا بۆ ژنکێ ژی ئەگەر ژ خوینا ژڤانی پاقژبوو بەری نڤێژا سپێدێ ئینیەیا خۆ بینیت بۆ رۆژی گرتنێ و پشتی نڤێژا سپێدێ سەرێ خۆ بشۆت ونڤێژا خۆ بکەت .

١٥- دروستە رۆژی گر سیواکی بکاربینیت پشتی نڤێژا سپێدێ و هەتا نڤێژا مەغرەب، ئانکو سیواك چ کارتێکرنێ ل سەر رۆژییا رۆژی گری ناکەت .

١٦- دڤێت مرۆڤێ رۆژی گر رۆژا خۆ ب خواندنا قورئانێ و گوتنا زکرێ خۆدێ و هەروەسا دووعایان و کرنا خێرانڤە بورینیت . چونکو رەمەزان هەیڤا خێرانە، و خەلاتێ وێ یێ مەزن ژی ئەوە کو مرۆڤ رازیبوونا خۆدێ ب دەستێن خۆڤە بینیت و ئازابیت ژ ئاگری .

١٧- مرۆڤێ رۆژی گر دڤێت دەستهەلاتێ ل سەر نەفسا خۆ بکەت، و ئاخفتنێن شکەستی نەبێژیت،

***چونکۆ ئێك ژ مفایێن ڕەمەزانێ ئەوە نەفسا مرۆڤی بهێتە پەروەردەکرن ژ بۆ کرنا کارێ چاك و هێلاتنا کارێن خراب .***

***١٨- ڕۆژیا مرۆڤی ناکەڤیت ئەگەر دویکێل چوو گەوریا مرۆڤی نە ب مەڕەما مرۆڤی .***

***١٩- ئەگەر مرۆڤێ ڕۆژی گر ژبیرکر کو یێ ب ڕۆژیە خوارن خوار یان ئاڤ ڤەخوار دڤێت مرۆڤ وی هشیاربکەت کو ئەو یێ ب ڕۆژیە، وئەڤە ژی هاریکاری یە ل سەر خێرێ .***

***٢٠- دڤێت ڕۆژی گر ب هەمی ئەندامێن خۆڤە یێ ب ڕۆژی بیت، نە بنێریتە تشتێن گوننەه یان ژی گوهێ خۆ بدەتە ستانان یان ب ئەزمانێ خۆ غەیبەتا موسلمانان بکەت .***

***٢١- یا ژ سوننەتێیە مرۆڤ خۆ مەرد بکەت و گەلەك خێران بکەت .***

***٢٢- ژ ئەگەرێن ئازاکرنا مرۆڤی ژ ئاگری مرۆڤ ڕۆژیێن خۆ بگریت و تەراویحان ب جەماعەت بکەت ل مزگەفتێ و هەروەسا شەڤا ( لیلة القدر ) رابیتە عیبادەتی .***

***٢٣- باشترین سەدەقە، سەدەقا ڕەمەزانێیە، ئانکۆ مرۆڤی ئەگەر دەه هزار دینار کرنە خێر بەری ڕەمەزانێ و هەروەسا دەه هزار دینار کرنە خێر د ڕەمەزانێدا، ئەو دەه هزارێن کرینە خێر د ڕەمەزانێدا خێرا وان***



***پترە ژ دەه هزارێن کرینە خێر بەری ڕەمەزانێ؛ چونکۆ جێوازی یا هەی دناڤبەرا هەردوو وەختاندا .***

***٢٤- ئەو کەسێ هێجەتەکا شەرعی ( عذر شرعي ) هەبیت کو ڕۆژیا نەگریت، یا باشتر ئەوە بۆ وی کو ڕۆژیا بگریت چونکۆ بۆ وی ب خێرترە، هەروەکو خۆدێ د قورئانێدا دیارکری (وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ) سورة البقرة الاية ١٨٤ .***

***٢٥- ڕابوونا شەڤا ( ليلة القدر ) بۆ عیبادەتی، چونکۆ خێرا عیبادەتێ ڤێ شەڤێ ژ خێرا عیبادەتێ هزار هەیڤان بخێترە، و خۆدێ قورئانا پیروز دڤێ شەڤێدا یا ئیناتیە خوارێ .***

***٢٦- ڕۆژی گر ژبیرنەکە کو مەلائیکەت داخۆازا ژێبرنا گوننەهان بۆ تە دکەن .***

***٢٧- هەیڤا ڕەمەزانێ هەیڤا بێهنفرەهییێیە، و جزایێ بیهنفرەهی بەهشتە، ڤێجا موسلمان دڤێت تۆ یێ بهێنفرەه بی دا تۆ ڤێ خێرا مەزن ژدەستێن خۆ نەکەی .***

***٢٨- گوننەهێن ڕۆژی گەران ل شەڤا دووماهییێ ژ ڕەمەزانێ د هێنە ژێبرن .***

***٢٩- موسلمان گەلەك دووعان بۆ خۆ بکە و هەروەسا بۆ موسلمانان بکە چونکۆ هەیڤا ڕەمەزانێ دووعا یێن قەبول کرینە***

***٣٠- گەلەك ڕۆژی گر فتارێ ل مالێ دکەن وب ئەگەرێ ڤێ چەندێ ناچنە نڤێژا مەغرەب، وئەڤ چەندە***

یا خەلەتە؛ چونکو ئەو ب ڤێ چەندێ خێرا نڤێژا ب جەماعەت ل مزگەفتێ ژ دەستێن خو دەکەن .

**چەند وەسیەت بو مروڤێ رۆژی گر :**

١- هشیاربە !! موسلمان چ رۆژییا نە خو بێ هێجەتەکا شەرعی ( عذر شرعي )، و ئەگەر هات و تە رۆژی یەك خوار دڤێت تو وێ رۆژێ ئەداکەی و تو تەوبەکا ژ دل بکەی، و چێ دبیت هندەك جاران گوننەهڤژێبرکێ ژی (الکفارة) بدەی .

٢- هندەك جاران فتارێ بدە هندەك رۆژی گرا، دا تو هندی خێرا وان ب دەستێن خوڤە بینی .

٣- پاراستنێ بکە ل سەر هەر پێنج نڤێژان کو تو ل مزگەفتێ بکەی، دا خودێ تە ب پارێزیت د رەمەزانێدا و پشتی رەمەزانێ ژی.

٤- هشیاربە !! تو وەختێ خو ژ دەست نەدە ژبەر هندەك کارێن نە گرنك یان وەکی گەلەك جحێلان بارپتر ژ وەختێ خو ب وەرزشێ ڤە دبورینن، موسلمان هشیاربە ل رۆژا قیامەتێ خودێ دێ حیسابێ دگەل تە کەت !!!

٥- ئەگەر تو بشێیی عومرەکێ بکەی دەهەیڤا رەمەزانێدا گەلەك باشە، چونکو خێرا عومرێ د رەمەزانێدا هندی خێرا حەججەکێیە .

٦- موسلمان هەیڤا رەمەزانێ دەلیڤەکە بو هێلانا گەلەك گوننەهان، ڤێجا تو هەولبدە کو تو هندەك گوننەهان بهێلی ئەوێن ل دەڤ تە، بگرە ژهێلانا



غەیبەتێ یان گوهدانا سترانان یان جگاران یان هەرگوننەهەکا هەبیت .

٧- پشتی رەمەزان ب دووماهی بهێت، شەش رۆژان ژ هەیڤا شەوالێ بگرە، چونکو خێرا وێ هەر وەکو تو سالێ هەمییێ ب رۆژی بووی . ( فمن صام رمضان وأتبعه ستاً من شوال فکأنما صام الدهر کله ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی . و دروستە مروڤ ژ رۆژا دوێ یا جەژنا رەمەزانێ ڤان رۆژییان دەست پێ بکەت .

٨- گەلەك سەلەواتان ل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بکە .

٩- ئەزمانێ خو ژ غەیبەتێ و درەوا و فەسادییێ ب پارێزە؛ چونکو ئەڤ گوننەهە خێرا رۆژییێ کێم دکەن .

١٠- موسلمان بو زانینن تە ئەو کەسێ بێژیت رۆژی گرتن نینە و نە فەرزە ل سەر موسلمانان، ئەو کافر دبیت ب ڤێ ئاخفتنێ و دێ هێتە شیرەتکرن تەوبەبکەت و ب زفریت ژ ڤێ ئاخفتنێ .

١١- رۆژی گرتن ل سالا دووێ مشختی فەرز بوون ل سەر موسلمانان، و پێغەمبەری سلاڤ لێ بن نەهـ هەیڤێن رەمەزانێ یێ ب رۆژی بووی .

***فتره ( زكاة الفطر ) :***

***١- ئەڤ زكاتە يا جانێ مرۆڤييە، ژبەر ئەگەرێ دووماهی هاتنا هەیڤا ڕەمەزانێيە .***

***٢- ئەركە ل سەر جانێ هەر موسلمانەكێ و جانێ وان كەسان ئەوێن مرۆڤ وان خۆدان دكەت . و هەر مرۆڤەكێ خۆارنا ڕۆژا جەژنێ و شەڤا جەژنێ هەبیت دێ زەكاتا فترێ دەت.***

***٣- پێش هەر جانەكێڤە ( صاع )ە كە ، ژ خۆارنا خەلكێ باژێری، و هەر ساعەك(صاع) دبیتە سێ كیلو گرام .***

***٤- دەمێ دانا زكاتا فترێ بەری نڤێژا جەژنێيە، و دروستە ئەگەر مرۆڤ بەری ڕۆژا جەژنێ ب ڕۆژەكێ یان دوو ڕۆژان بدەت . و ناچێبیت ب هیچ ڕەنگ مرۆڤ زكاتا فترێ پشتی نڤێژا جەژنێ بدەت، لێ ئەو مرۆڤە تێ نەبیت یێ هێجەتەكا شەرعی هەبیت، و ئەگەر مرۆڤەكێ بێ چ هێجەتێن شەرعی زكاتا فترێ گیرۆكر هەتا پشتی نڤێژا جەژنێ دێ ژێ هێتە قەبولكرن وەك سەدەقە .***

***٥- ناچێبیت مرۆڤ پاران بدەت چونگۆ ئەڤ چەند بەرەڤاژییێ سوننەتا پێغەمبەری یە سلاڤ لێ بن، و هەروەسا نا هاتیە ڤەگۆهاستن ژ چ سەحابان خودێ ژوان رازیبیت كو پارە پێش خوارنێڤە دابن .***

***٦- زەكاتا فترێ دێ هێتە دان بۆ مرۆڤێ فەقیر و یێ دەیندار و یێ چ ل مالێ نە .***



***٧- یا ئەرك ئەوە د دانا ڤێ زەكاتێدا مرۆڤ بگەهینیتە دەستێ فەقیری یان وەكیلێ وی بەری نڤێژا جەژنێ .***

***لدووماهییێ برایێ موسلمان هشیاربە چ ڕۆژان ژ ڕەمەزانێ نە خۆ، چونكۆ ئەگەر تۆ عەمرێ خۆ هەمییێ ب ڕۆژی بی تۆ هندی خێرا وێ ڕۆژێ ب دەستێن خۆڤە نائینی، موسلمان بلا هەمی ئەندامێن تە ب ڕۆژی بن ، و هەروەسا پێشەوازییا ڕەمەزانێ بكە كو دەلیڤەكە تۆ دێ برێكا وێ خۆ نیزیكی خۆدێ كەی، و دێ بیتە خالەكا گوهارتنێ د ژیانا تەدا بەرڤ باشییێ و چاكییێ . ئەز دووعان ژ خۆدێ دكەم گوتن و كریارێن مە بۆ وەجهێ خۆ یێ پیروز حیسابكەت، و مە ژ ئازاكرێن ئاگری حیسابكەت ... آمین***

# چەند پرسیار
# ل سەر ئەحامێن هەیڤا ڕەمەزانێ

بەرسڤ دان
العلامة الشیخ/ محمد بن صالح العثیمین
وەرگێران / أبو بکر کوچر



**١ – هاتیە ڤەگوهاستن ژ پێغەمبەرێ سلاڤ لێ بن کو وی دوعایەك گۆتبیت دەمێ هەیڤ د دیت ؟**

**ب/ بەلێ، ئەگەر پێغەمبەری سلاڤ لێ بن هەیڤ دیتبا دا بێژیت : الله أكبر ، اللهم أهلّه علينا باليمن و الايمان و السلامة و الاسلام و التوفيق لما تحبه و ترضاه، ربي و ربك الله، هلال خير و رشد .**

---

**٢– ئەرێ دڤێت مرۆڤ هەر ڕۆژ ئینیەتێ بینیت بۆ ڕۆژی گرتنا ڕۆژێن هەیڤا ڕەمەزانێ، یان ژی دروستە مرۆڤ جارەکێ بتنێ ئینیەتێ بینیت بۆ ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕمەزانێ هەمییێ ؟**

**ب/ دروستە مرۆڤ ئینیەتێ بینیت ل دەسپێکا هەیڤا ڕەمەزانێ بۆ ڕۆژی گرتنا ڕەمەزانێ هەمییێ، و ئەگەر مرۆڤی ئینیەتا خۆ ئینا بۆ ڕۆژی گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێ ل دەستپێکا ڕەمەزانێ؛ ل وی دەمی هەوجە ناکەت مرۆڤ هەر ڕۆژ ئینیەتا خۆ بینیت، بەلێ ئەگەر مرۆڤی ڕۆژەك خوار ب هێجەتەکا شەرعی (عذر شرعی) دڤێت مرۆڤ ئینیەتا خۆ نی کەتڤە، {نموونە/ مرۆڤەکێ ل دەستپێکا هەیڤا ڕەمەزانێ ئینیەتا خۆ ئینا کو ڕەمەزانێ هەمییێ ب ڕۆژبیت، بەلێ دەمێ گەهشتیە ڕۆژا دەهێ وەغەرەك بۆ چێبوو یان نەخوش بوو ڕۆژا دەهێ خوار، ل وی دەمی دڤێت ئەو ئنیەتا خۆ نی کەتەڤە بۆ ڕۆژێن دی یێن ڕەمەزانێ (وەرگێر) } .**

---

**٣– حوکمێ ڕۆژی گرتنا بچویکی د هەیڤا ڕەمەزانێ ؟**

ب/ رۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر بچویکی بەلێ سوننەت، خێرا رۆژی گرتنێ دێ بۆ وی هێتە ڤێسین بەلێ ئەگەر رۆژیا خۆ خوار ژی چ گونەهـ ل سەر وی نینن، بەلێ یا سوننەتە بۆ سەمیانێ وی فرمانا وی بکەت بۆ رۆژی گرتنا هەیڤا رەمەزانێ؛ دا بچویك فێری رۆژی گرتنێ بیت .

---

٤- حوکمێ رۆژی گرتنا مرۆڤێ نە نڤێژکەر؟

ب/ مرۆڤێ نڤێژان نەکەت رۆژیێن وی نەدروستن و ژێ ناهێنە قەبولکرن، چونکۆ مرۆڤێ نڤێژان نەکەت نە موسلمانە بەلکو کافر دبیت ژ بەر گۆتنا خودێ : (( فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ)) سورة التوبة الاية (١١) ڤێجا ئەگەر ئەوان پەرستنا خودێ ب تنێ کر، وپەیڤا تەوحیدێ گۆت، وپێگیری ب ئەحکامێن ئیسلامێ کر ژ کرنا نڤێژێ ودانا زەکاتێ، ئێدی ئەو برایێن هەوەنە د ئیسلامێدا. و هەروەسا ژبەر گۆتنا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ( بين الرجل وبين الشرك و الكفر ترك الصلاة ) ئیمامێ موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . د ناڤبەرا مرۆڤی و شرکێ وکوفرێدا نەکرنا نڤێژانە . ئانکو مرۆڤ ب نەکرنا نڤێژان وەکی مرۆڤەکێ موشرك یان کافر لێ دهێت .

---

٥- ئەرێ دروستە بۆ مروڤێ پالە ئەگەر شولەکێ ب زەحمەت کر رۆژیا خۆ بخوت ؟

ب/ دڤێت ئەو ب رۆژی بن و داخوازا هاریکرییێ ژ خودێ بکەن، چونکۆ هەرکەسەکێ داخوازیا



هاریکارییێ ژ خودێ بکەت خودێ دێ هاریکاریا وی کەت، بەلێ ئەگەر مرۆڤێ پالە دیت کو وەسا یێ تێهنیبووی یان یێ برسیبووی کو نەدویر ب هیلاك بچیت ب ئەگەرێ رۆژی گرتنێ، ل وی دەمی چ ل سەر وی نینە ئەگەر رۆژیا خۆ بخوت ژ بەر وێ فەراتیییێ (ضرورة) ، بەلێ یا ژ ڤێ هەمییێ ب خێرتر بۆ وانا کو ئەو رێکەفتنەکێ دگەل خودانێ شولی بکەن کو بۆ وانا دەمژمێرێن شولی کێمکەت، و ئەگەر خودانێ شولی ئەڤ چەندە قەبوول نەکر، بلا رێکەفتنەکا دی ل گەل بکەن کو هندەك دەمژمێرێن شولی بۆ وانا بکەتە ب شەڤێ، یان خودانێ شولی بیچەك شولی ل سەر وان سڤگ کەت و کێمکەت دا مرۆڤێن پالە بشێن شولێ خۆ بکەن ب ساناهی و هەروەسا خێزانێن خۆ ژی خودان کەن .

---

٦- ئەو کیش وەغەرە کو دروستە مرۆڤ رۆژیا خۆ بخوت سەرا وێ وەغەرێ ؟

ب/ وەغەرا دروست کو مرۆڤ رۆژیا خۆ پێ بخوت و نڤێژێن خۆ پێ کورت کەت دڤێت دویراتیا وێ ( ٨٣.٥ ) کیلومترن، و هندەك ژ زانایا دبێژن هەر دویراتیەك د عورفێ خەلکیدا وەغەر بیت دروست مرۆڤ رۆژیا خۆ بخوت {إن شاء الله ئەڤ بوچوونە یا دروسترە ژ بوچوونا ئێکێ (وەرگێر) } وپێغەمبەری سلاڤ لێ بن ئەگەر ب دویراتیا سێ فەرسخا وەغەرکربا دا نڤێژان کورت کەت { هەر فرسخەك نیزیکێ

هەشت کیلومترانە (وەرگێر) } ، و ئەکەر مرۆڤ چوو وەغەرەکا حەرام و گوننەهـ تێدابیت نا چێبیت ب هیچ رەنگ مرۆڤ رۆژیا خۆ بخوت یان نڤێژان کورت کە؛ چونکۆ وەغەرا حەرام دەستویری بۆ نەهاتیە دان مرۆڤ رۆژیا خۆ پێ بخوت، وهندەك ژ زانایا چ جێوازییێ ناکەن د ناڤبەرا وەغەرا دروست و یا نەدروست، ئانکو ئەگەر مرۆڤ یێ ب وەغەربیت ڤێجا چ ئەڤ وەغەرە یا حەلال بیت یان حەرام بن دروست مرۆڤ رۆژیا خۆ بخوت؛ چونکۆ دەلیلێن دستویردانا خوارنا رۆژییێ گشتنینە .

---

٧- ئەگەر مرۆڤ د هەیڤا رەمەزانێدا رۆژیەکێ بخوت ب هێجەتەکا شەرعی (عذر شرعی). دروستە بۆ مرۆڤی کو ئەو وەختێ مای ژ رۆژێ مرۆڤ بخوت و ڤەخوت ؟

ب/ ئەگەر مرۆڤی ب هێجەتەکا شرعی رۆژیا خۆ خوار، دروستە ئەو وەختێ مای ژ رۆژێ مرۆڤ بخوت و ڤەخوت {نموونە/ مرۆڤەکێ سپێدێ رۆژیا خۆ خوار ب هێجەتەکا شرعی دروستە بۆ وی مرۆڤی ئەو فرافینێ یان هەر تشتەکێ دی بخوت؛ چونکۆ گوننەها خوارنا رۆژا رەمەزانێ ل سەر رابوو( وەرگێر) } لێ ئەگەر مرۆڤەکی رۆژیا خۆ خوار بێ چ هێجەتێن شەرعی نا چێ بیت ب هیچ رەنگ ئەو بەردەوامییێ بدەتە خوارنێ و ڤەخوارنێ ژ وەختێ مای ژ رۆژێ؛ چونکۆ ئەوی بێ چ هێجەتییێن شەرعی رۆژیا خۆ یا خواری، ئەز هیڤی دکەم جێوازی بهێتە کرن د ناڤبەرا ڤان



هەردوو جوراندا. {مرۆڤێ ب هێجەتەکا شەرعی رۆژیا بخوت ومرۆڤێ ب چ هێجەتین شەرعی رۆژییێ بخوت – وەرگێر}

---

٨- مرۆڤێ نەخوش ب نەخوشییەکا بەردوام دێ چ کەت بۆ گرتنا رۆژییێن هەیڤا رەمەزانێ ؟

ب/ ئەگەر مرۆڤەك یێ نەخوش بیت ب نەخوشییەکا بەر وەخت، ئەو دێ رۆژییێن خۆ خوت بەلێ پشتی هەیڤا رەمەزانێ ئەو دێ وان رۆژییێن خواری ئەداکەت، و ئەگەر مرۆڤەك یێ نەخوش بیت ب نەخوشییەکا بێ هیڤی ژ ساخ بینا وی، ئەو دێ پێش هەر رۆژەکێڤە خوارنا مسکینەکێ دەت ئەو ژی چارێکا ساعەکییە (صاع) ژ گەنمی یان نیڤ ساعە (صاع) ژ غەیری گەنمی وەکو برنجی { تێبینی هەر ساعەك دبنە سێ کیلو گرام (وەرگێر) } ، و ئەگەر نوژداری گوتە مرۆڤەکێ رۆژی گرتن ل هاڤینێ بۆ ساخلەمییا تە نەباشن، ل وی دەمی ئەم دێ بێژنێ دڤێت تۆ رۆژییێن خۆ بخوی ل هاڤینێ و زڤستانێ وان رۆژییێن تە خوارین ل هاڤینێ ئاداکەی؛ چونکۆ ئەڤ جورە مرۆڤە سەروبەری وی جێوازە ژ سەروبەرێ مرۆڤێ نەخوشییا وی یا بەردەوام بیت .

---

٩- حوکمێ رۆژی گرتنا وان مرۆڤان چەوانە ئەوێن ب رۆژ هەمییێ نڤستی وهندەك ژ وان نڤێژان دکەن وهندەکێن دی نڤێژان ناکەن ئەرێ رۆژی گرتنا ڤان مرۆڤان دروستە یان نە؟

ب/ ڕۆژییا وان دروستە بەلێ خێرا وێ گەلەك یا کێمە، و هەروەسا ئەڤ کارێ وان بەروڤاژییێ مەرەما شەریعەتییە؛ چونکۆ خودێ دەرهەقێ ڕۆژییێدا دبێژیت (( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)) سورة البقرة الاية (١٨٣). ئەی گەلـی ئەوێن باوەری ب خودێ وپێغەمبەرێ وی ئـینـای وکار ب شریعەتێ وی کری، خودێ ڕۆژی ل سەر هەوە نڤیسییە کانێ چاوا ل سەر مللەتێن بەری هەوە نڤیسی بوو؛ دا بەلکی هوین تەقوا خودایێ خـۆ بکەن، و ـ ب گوهداری وپەرستنا وی ب تنێ ـ پەرژانەکی بکەنە د ناڤبەرا خـۆ وگونەهاندا .

و ئەم هەمی دزانن مرۆڤێ نڤێژان ژ دەست بدەت یان گرنگییێ نە دەتێ نە ژ تەقوا خودێ یە، و ئەڤ چەندە بەروڤاژییێ مەرەما خودێ و پێغەمبەرێ خودێ یە سلاڤ لێ بن د فەرزکرنا ڕۆژییێدا، و یا ژ هەمییێ سەیرتر کو بارپتر ژڤان مرۆڤان دمیننە هشیار هەتا وەختەکێ درەنگ ژ شەڤێ و ب ڕۆژێ ژی هەمییێ نڤستینە، و نەبەس ئەڤە ژی بەلکو بارپتر ژ ڤان مرۆڤان دمیننە هشیار سەرا تشتەکێ بێ مفا یان تشتەکێ گونەهـ!! .

شیرەتا من بۆ ڤان مرۆڤان و هەروەسا یێن وەکی وان بلا تەقوا خودێ بکەن و وەسا ڕۆژیێن خۆ بگرن کو ئەو ڕازیبوونا خودێ ب دستێن خۆڤە بینن و داخوازا هاریکارییێ ژ خودێ بکەن بۆ گرتنا ڕۆژییێ، و



هەروەسا ڕۆژا خۆ ب خواندنا قورئانێ و زکرێ خودێ ڤە بورینن، و هەروەسا پارێزێ ل سەر نڤێژان بکەن و باشییێ دگەل خەلکی بکەن و هەر خێرەکا دی هەبیت ژ خێرێن شەرعێ ئیسلامێ بەرێ مە موسلمانا دابیتێ هوین ل دویڤ شیانێن خۆ بکەن .

---

١٠- ئەگەر مرۆڤ هشیاربوو سپێدێ و یێ ب جەنابەت بیت بەلێ د ئینیەتا مرۆڤیدا بیت کو ب ڕۆژی بیت، ئەرێ ڕۆژییا مرۆڤی دروستە ؟

ب/ ئەگەر مرۆڤ ژ خەو ڕابوو یێ ب جەنابەت و مرۆڤی دڤێت ب ڕۆژی بیت، ل وی دەمی دروستە مرۆڤ ب ڕۆژی بیت و چ گونەهـ ل سەر مرۆڤی نینە؛ چونکۆ پێغەمبەری ژی سلاڤ لێ بن هندەك جاران یێ ژ خەو ڕابووی ب جەنابەت و پشتی هینگێ سەرێ خۆ یێ شوشتی و یێ ب ڕۆژی بووی، و پێغەمبەر سلاڤ لێ بن باشترین چاڤلێکەرە کو ئەم چاڤلێبکەن، بەلێ یا ئەرك ئەوە کو مرۆڤ سەرێ خۆ بشوت ونڤێژا سپێدێ بکەت بەری ڕۆژ(الشمس) ب درکەڤیت؛ چونکۆ گیروکرنا نڤێژا سپێدێ ژ وەختێ وێ ب هیچ ڕەنگ نا چێ بیت.

---

١١-حوکمێ کارئینانا کلێ چاڤان بۆ مرۆڤێ ڕۆژی گر و هەروەسا کارئینانا قەتران بۆ چاڤ و دفن و گوهان؟

ب/ چ نینە بۆ مرۆڤێ ڕۆژی گر ئەگەر کلێ چاڤی ب دانیت، و هەروەسا دروستە قەترێ بکەت چاڤێن خۆ یان گوهێن خۆ هەتا ئەگەر تاما وێ قەترێ ژ گەورییا وی هات؛ چونکۆ ئەڤ چەندە ناهیتە هژمارتن ژ خوارنێ

و ڤەخوارنێ ئەوا رۆژی پێ دكەڤیت، و ئەڤ چەندە ژی بوچوونا (شیخ الاسلام ابن تیمیة) خودێ ژێ رازیبیت و ئەڤەیە یا دروستە، بەلێ ئەگەر قەترە كرە دفنا خۆ و ئەو قەترە چوو خوارێ د گەورییا ویدا ل وی دەمی رۆژی پێ دكەڤیت ئەگەر ب مەرەم ئەڤ چەندە كر؛ ئەو ژی ژ بەر گۆتنا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ( وبالغ في الاستنشاق إلا أن تكون صائما ) ئیمامێ ئەبو داوود ئەڤ حەدیسە یا ڤەگوهاستی . شرۆڤەكرنا حەدیسێ/گەلەك ئاڤێ بكە د دفنا خۆ دا دەمێ تۆ دستنڤێژێ دگری بەلێ ئەو دەمە تێنەبیت وەكی تۆ ب رۆژی . { بوچی؟ دەمێ مرۆڤ یێ ب رۆژی بیت گەلەك ئاڤێ نەكەتە د دفنا خۆ دا ؛ چونكۆ ئەگەر ئاڤ چوو خوار د دفنێدا دێ د گەوریییێدا چیتە خوارێ وئەگەر د گەوریییێدا چوو خوار هینگێ رۆژی پێ دكەڤیت و نەدویرە مرۆڤ ب ڤێ چەندێ گونەهكار بیت (وەركێر) }.

---

١٢- دروستە بۆ مرۆڤێ رۆژی گر ئامیرەتێ تەنگەنەفەسییێ ( بخاخ الربو ) بكاربینیت ؟

ب/ دروستە مرۆڤێ رۆژی گر ئامیرەتێ تەنگەنەفەسی بكاربینیت د دەمێ رۆژیییێدا – ڤێجا ئەڤ رۆژییە چ ژ رۆژێن هەیڤا رەمەزانێ بیت یان ژی ژ هەر هەیڤەكا دیبیت – چونكۆ ئەو هەوایێ دڤی ئامیرەتیدا نا گەهیتە مەعیدەی، لێ دگەهیتە ستوینكا هەوای ( القصبة الهوائية )، و پشتی هینگێ مرۆڤ ب دروستاهی هەوای د هلكێشیت و چ كارتێكرنێ ل سەر مەعیدەی



ناكەت ب هیچ رەنگ، و كارئینانا ڤی ئامیرەتی نا هێتە هژمارتن ژ خوارنێ یان ڤەخوارنێ .

---

١٣ – ئەگەر مرۆڤی رۆژی گر شرانقە دانات، ئەرێ رۆژییا وێ پێ دكەڤیت یان نە؟

ب/ شرانقە دبنە دوو جور

أ- ئەو شرانقەیە ئەوا مرۆڤ دانیت ب مەرەما تێركرنێ ( التغذية ) ژ خوارنێ، و ئەڤ جورە شرانقە رۆژی پێ دكەڤیت .

ب- ئەو شرانقەیە ئەوا مرۆڤ دانیت نە ب مەرەما تێركرنێ ( التغذية )ژ خوارنێ، بەلكو ژبەر چارەسەركرنێ ژ نەخوشییەكێ و ئەڤ جورە شرانقە رۆژی پێ نا كەڤیت .

---

١٤ – چەند خوین ژ مرۆڤی بهێت رۆژی پێ دكەڤیت؟

ب/ ئەو خوینا رۆژی پێ دكەڤیت خوینا پیسە ئەوا ب رێكا حیجامێ ( الحجامة ) د دەركەڤیت ژبەر گۆتنا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن : ( أفطر الحاجم و المحجوم ) ئیمامێ ئەبو داوودی و ئبن ماجەی و دارەمی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروستكری د-مشكاة المصابيح-دا . و دێ هێتە پیڤان ل سەر ڤێ چەندێ دەمێ مرۆڤ گەلەك خوینێ ژ خۆ بینیت ب هلبژارتنا مرۆڤی؛ چونكۆ لەشێ مرۆڤی پێ لاواز دبیت دەمێ مرۆڤ گەلەك خوینێ ژ خۆ بینیت ب رێكا حیجامێ یان ب رێكا هەرتشتەكێ دی . و هەر وەكو ئەم دزانن ئیسلام چ جاران جێوازییێ نا ئێخیتە د

ناڤبەرا دوو تشتان یێن وەکی ئێك ، وهەر وەسا ئیسلام چ جاران دوو تشتێن جێواز دگەل ئێك کوم نا کەت د دەمێ پیڤانێدا .

و ئەگەر خوین ژ مرۆڤی هات بێ مەرەما مرۆڤی وەکی دەمێ خوین ژ دفنا مرۆڤی دهێت بێ مەرەما مرۆڤی یان مرۆڤ تبلێن خۆ بێ مەرەم ببریت یان مرۆڤ پێل شوشەی بنیت یان هەر تشتەکێ دی کو خوینێ ژ مرۆڤی بهێت بێ مەرەما مرۆڤی هینگێ رۆژی نا کەڤیت، هەتا ئەگەر گەلەك خوین ژ مرۆڤی هات؛ چونکۆ بێ مەرەما مرۆڤییە .

و هەروەسا ئەگەر مرۆڤ چوو نەخوشخانێ و نوژداری ژ مرۆڤی خواز کو هندەك خوینێ ژ لەشێ مرۆڤی بکێشیت ژبەر دەستنیشانکرنا نەخوشییێ، ل وی دەمی دروستە مرۆڤێ رۆژی گر هندەك خوینێ ژ لەشێ خۆ بینیت دا نوژدار بشێت نەخوشییا مرۆڤی چارەسەرکەت . و هەروەسا ئەگەر ئەڤ داخواز ژ مرۆڤی هاتە کرن ل نەخوشخانێ ژبەر رێڤەبرنا شولەکێ مرۆڤی هینگێ ژی دروستە و رۆژی پێ نا کەڤیت .

---

**١٥- دروستە بۆ ژنکا موسلمان ئەگەر حەبکێن(حبوب) نەهێلانا هاتنا خوینا ژڤانی د هەیڤا رەمەزانێدا بکاربینیت ؟**

ب/ یا ئەز دبینم کو ژنکا موسلمان ئەڤان حەبکان نە دهەیڤا رەمەزانێدا بکاربینیت و هەروەسا نە ژ غەیری هەیڤا رەمەزانێ؛ چونکۆ بۆ من دیاربوو ل دویڤ



گۆتنێن نوژداران کو کارئینانا ڤان حەبکان زیانی دگەهینتە لەشێ ژنکێ و هەروەسا خوینا وێ ژی ، و هەروەکو ئەم دزانن هەرتشتەکێ زیان تێدابیت بوو مرۆڤی نا چێبیت مرۆڤ وی تشتی بکاربینیت، ژبەر گۆتنا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ( لا ضرر ولا ضرار ) ئبن ماجەی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی و ئیمامێ ئەلبانی یا دروستکری . و شرۆڤەکرنا حەدیسێ ئەڤەیە / نە زیانێ بکە ونە زیانێ ل خۆ بکە .

---

**١٦- ئەگەر مرۆڤێ رۆژی گر ژبیرکر کو یێ ب رۆژییە ڤێجا چ خوارن خوار یان ژی ئاڤ ڤەخوار، ئەرێ رۆژییا وی دکەڤیت ؟**

ب/ ئەگەر مرۆڤێ رۆژی گر ژبیرکر کو یێ ب رۆژییە و چ خوارن خوار یان ژی ئاڤ ڤەخوار ل وی دەمی رۆژییا وی یا دروستە و چ ل سەر وی نینە؛ ژبەر گۆتنا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ( من نسي وهو صائم فأكل أو شرب فليتم صومه، فإنما أطعمة الله وسقاه) ئیمامێ بوخاری و موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی .

شرۆڤەکرنا حەدیسێ / ئەگەر ئێکێ ژبیرکر کو یێ ب رۆژییە و خوارن خوار یان ژی ئاڤ ڤەخوار بلا رۆژییا خۆ تەمام کەت، خودێ ئەو خوارن و ڤەخوارنە یا داییێ

---

**١٧- هندەك ژ خەلکی بەردەوامییێ د دنە خوارنێ وڤەخوارنێ هەتا بانگێ سپێدێ یێ دووێ دهێتە دان، ئەرێ رۆژییا ڤان کەسان دروستە ؟**

ب/ ئەگەر مرۆڤ یێ پشت ڕاست بیت کو موئەزن هەر دەم د دەمێ بانگیدا بانگی دەت دڤێت ل وی دەمی مرۆڤ خوارنێ و ڤەخوارنێ بهێلیت ئێکسەر، و ئەگەر مرۆڤ بزانیت کو موئەزن گەلەك جاران بەری دەمێ بانگی بانگی دەت ل وی دەمی دروستە مرۆڤ بەردەوامییێ ب دەتە خوارنێ و ڤەخوارنێ هەتا موئەزن بەری بانگی ب دووماهی بینیت، بەلێ دڤێت مرۆڤێ موسلمان هەردەم بەری بانگی ب دەمژمێرەکێ کورت پاشیڤێ بخوت ویێ ئامادەبیت بۆ بانگی و بچیتە مزگەفتێ دا نڤێژا سپێدێ ل مزگەفتێ ب جەماعەت بکەت .

---

**١٨- حوکمێ وی کەسی چییە ئەوێ دچیتە نڤینا ژنکا خۆ ب ڕۆژ د هەیڤا ڕەمەزانێ ؟**

ب/ ئەگەر ڕۆژی گرتن نە ئەرك بیت ل سەر هەردووان دروستە بوو هەردووان . { نموونە/ ئەگەر هەردوو ل وەغەرەکێ بن وئەم دزانن کو مرۆڤێ وەغەرکری ڕۆژی گرتن نە ئەرکە ل سەر وی ل وی دەمی دروستە بوو هەردووان و چ گونەهـ ل سەر هەردووان نینە، هەتا ئەگەر هەردوو ب ڕۆژی بن ژی ، بەلێ ڕۆژییا هەردووان دەکەڤیت و دڤێت ئەو پشتی ڕەمەزانێ ئاداکەن (وەرگێر)} .

بەلێ ئەگەر ئەو کەسە نە یێ وەغەرکری بیت یان نە یێ نەخوش بیت ئانکو ڕۆژی گرتن ل سەر وی ئەرك بیت ل وی دەمی حەرامە بۆ وی ئەگەر بچیتە نڤینا ژنکا



خۆ و گونەهەکا مەزنە، و دڤێت ئەو تەوبەبکەت و عەبدەکی ئازاکەت و ئەگەر پێ چێنەبیت دێ دوو هەیڤان { یێت ئسمانی (وەرگێر)} ب ڕۆژی بیت و ئەگەرێ وێ ژی نەشێت دێ شێست مسکینان تێرکەت، وهەروەسا ژنکا وی ژی ئەگەر ئەڤ چەندە ب هلبژارتنا وێ بیت دڤێت ئەو ژی تەوبەبکەت و کفارێ بدەت وەکی زەلامێ خۆ ، و ئەگەر ئەڤ چەندە نە ب هلبژارتنا وێ بیت ئانکو زەلامێ وێ ب خورتی چوو نڤینا وێ ل وی دەمی چ ل سەر وێ نینە .

---

**١٩- کارئینانا مەعجینێ ددانا ڕۆژی پێ دکەڤیت یان نە ؟**

ب/ کارئینانا مەعجینێ ددانا ڕۆژی پێ نا کەڤیت ئەگەر نە چیتە خوارێ د گەورییێدا، بەلێ یا چێتر ل دەف من مرۆڤێ موسلمان مەعجینێ ددانا بەس ب شەڤێ بکاربینیت؛ چونکۆ ئەڤ مەعجینە گەلەك یێ ب هێزە و نەدویرە بچیتە خوارێ د گەورییێدا و مرۆڤێ موسلمان پێ نەحەسیێت .

---

**٢٠- مەرەم ژ بەرەکاتا پاشیڤێ چییە ئەوا د حەدیسا پێغەبەری دا هاتی سلاڤ لێ بن ؟**

ب/ مەرەم ژ وێ بەرەکەتێ بەرەکەتا شەرعییە و بەرەکەتا لەشییە، هندیکە بەرەکەتا شەرعییە مرۆڤ گۆتنا پیغەمبەری سلاڤ لێ بن ب جه دئینیت و هەروەسا مرۆڤ چاڤ ل پیغەمبەری دکەت سلاڤ لێ بن، و

بەرەکەتا لەشی ژی ئەوە کو لەشێ مرۆڤی پێ د هێز کەڤیت بۆ ڕۆژی گرتنێ .

---

**٢١- د حەدیسێدا یا هاتی ( من أفطر صائما كان له مثل أجره غير أنه لا ينقص من أجر الصائم شيئا ) ئەرێ ئەگەر مرۆڤ بەس ئاڤێ یان خورمێ ب دەتە مرۆڤێ ڕۆژی گر، دێ ئەڤ حەدیسە ژ مرۆڤ گریت کو خودێ دێ هندی خێرا مرۆڤێ ڕۆژی گر دەتە مرۆڤی ؟**

ب/ دوو بوچوونێن زانایا یێن هەین بۆ شرۆڤەکرنا ڤێ حەدیسێ، هندەك ژوانا دبێژن دروستە هەتا ئەگەر مرۆڤ قەسپەکێ بتنێ ب دەتە مرۆڤێ ڕۆژی گر ، وهندەك زانایێن دی دبێژن دڤێت خوارنێ بدەتە مرۆڤێ ڕۆژی گر دا خودێ وەکو خێرا مرۆڤێ ڕۆژی گر ب دەتێ؛ چونکۆ خوارن دێ هاریکاریا مرۆڤێ ڕۆژیگر کەت هەتا ب شەڤێ و چێ د بیت پاشیڤێ ژی نەخوت . بەلێ یا دیار ژ حەدیسێ ئەگەر خۆ مرۆڤ قەسپەکێ ب دەتە مرۆڤێ ڕۆژی گر خودێ دێ هندی خێرا مرۆڤێ ڕۆژی گر دەتە مرۆڤی، و ژبەر ڤێ چەندێ دڤێت مرۆڤێ موسلمان ئەڤێ خێرا مەزن ژ دەستێن خۆ نەکەت، بلا هەردەم چەند قەسپان ببیتە مزگەفتێ دا مرۆڤێن موسلمان فتارێ پێ بکەن، و خودێ هندی خێرا هەر موسلمانەکێ وان قەسپان بخوت ب دەتێ .

---

**٢٢- مرۆڤێ ڕۆژی گر فتارێ ل دویڤ بانگێ موئەزنی بکەت یان ژی ل دویڤ بانگێ تەلەفزیونێ و رادیونێ بکەت ؟**



ب/ ئەگەر موئەزن ل دویڤ ڕۆژێ(الشمس) بانگی ب دەت ل وی دەمی دڤێت مرۆڤ ل دویڤ بانگێ موئەزنی فتارێ بکەت؛ چونکۆ موئەزن یێ ل دویڤ چوونا خوارا ڕۆژێ(الشمس) بانگی د دەت، ئانکو یێ ب چاڤێن خۆ د بینیت کو ڕۆژ(الشمس) یا دچیتە خوارێ ، بەلێ ئەگەر موئەزن ل دویڤ دەمژمێری بانگی دەت و ڕۆژێ(الشمس) نا بینیت، ل وی دەمی یا چێتر ئەوە مرۆڤ ل دویڤ بانگێ تەلەفزیونێ یان یێ رادیونێ فتارێ بکەت؛ چونکو دەمژمێر بۆ دەمژمێری جێوازە، لێ دەمژمێرێ تەلەفزیونێ یێ چێترە و موکمترە .

# پروژێن خێرێن مـــــــەزن د هەیڤا ڕەمەزانێدا



برایێ موسلمان تە دڤێت تو خو ژ تهێناتیا ٥٠.٠٠٠ سالان ل ڕوژا قیامەتێ ب پارێزی ؟؟؟ دەمێ تو ڕەمەزانێ ب ڕوژی دبی، تو نیزیکی ١٤ دەمژمێران ب ڕوژی دبی، ئانکو نیزیکی ٥٠.٠٠٠ سانیا، تو دزانی برا کو گرتنا ٥٠.٠٠٠ سانیا د ڕوژا ڕەمەزانێدا دێ تە ژ تێهنا ٥٠.٠٠٠ سالێن ڕوژا قیامەتێ قورتالکەت . ئانکو ڕوژی گرتنا سانیەکێ ژ ڕوژا ڕەمەزانێ بەرامبەری هزار سالێن گەرماتییێ و تێهناتییێ ل ڕوژا قیامەتێ .

برایێ من یێ خوشتڤی ... ئەگەر ڕەمەزان ژ تە چوو چ خێر ناهێنە بەرامبەری خێرا وێ ، ئەگەر بەری نوکە چەند ڕەمەزان تە ژ دەست دابن بێ هیڤی نەبە، دەستێن خو هلدە و دگەل مە ئەڤان پروژێن خێران جێبەجێبکە د هەیڤا ڕەمەزانێدا....

<u>پروژێ ملیار خێران د سیە ڕوژاندا :</u>

برا تو دزانی کو خێرا ختمەکا قورئانێ نە د هەیڤا ڕەمەزانێدا ب( ٣.٣ ملیون ) خێرانە، ئانکو ئەگەر خودێ ژتە قەبولکەت، دێ ( ٣.٣ ملیون ) گوننەهێن تە دێ هێنە ژێبرن ... بەلێ ختما قورئانێ د هەیڤا ڕەمەزانێدا یا جێوازە !! بوچی ؟ چونکو خێرا عومرێ د ڕەمەزانێدا هندی خێرا حەجەکێیە دگەل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن، هەروەسا خێرا خواندنا قورئانێ ژی دێ یا جێواز و پتربیت، ئانکو خێر دهێنە دوقات کرن د هەیڤا ڕەمەزانێدا . ڤێجا برا ما نە مخابن تو ڤێ

خێرا هند مەزن ژ دەستێن خۆ بکەی پشتی هینگی ل رۆژا قیامەتێ پەشێمان ببی، و ل وی دەمی پەشێمانی فەیدەناکەت .

**پرۆژێ گوهورینێ :**

دەستپێکا هەیڤا رەمەزانێ بلا ببیتە خەلەکا گوهورینێ د ژیانا تەدا، و هەولبدە کو تۆ ل رۆژا ئێکێ ژ رەمەزانێ بێیە ئازاکرن ژ ئاگری ، هەر ژ شەڤا ئێکێ بلا ئارمانجا تە ئەڤە بیت  تۆ بهێیە ئازاکرن ژ ئاگری، و تایبەت دەمێ تۆ فتارێ دکەی، چونکۆ ل وی دەمی مرۆڤێ رۆژی گر دووعایەکا قەبولکری یا هەی، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( إن لله تبارك وتعالى عتقاء في كل يوم وليلة ) ئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری . خۆدێ چەند مرۆڤێن ئازاکری یێن هەی دهەمی شەڤ و رۆژاندا، د هەیڤا رەمەزانێدا، ڤێجا برا تۆ دزانێ رامانا ڤێ حەدیسێ چیە ؟ برایێ موسلمان تە ( ٦٠ ) دەلیڤێن هەین درەمەزانێدا کو تۆ بهێیە ئازاکرن ژ ئاگری .

**پرۆژێ ساخکرنا دەمژمێرەکێ مری :**

برا ئەم هەمی دزانن کو پشتی خۆارنا شیڤێ هەتا بەری نڤێژا عەیشا نیزیکی (٤٠) دەقیقان مرینە، ڤێجا بارا پتر ژ خەلکی ڤان دەقیقان ب سەحکرنا تەلەفزیونێڤە د بورینن، ئانکۆ خۆ موژیل دکەن هەتا دەمێ نڤێژا عەیشا بهێت، برا ما تۆ بۆ چی وی دەمژمێری بۆ خۆ مفای ژێ ناکەی ب خۆاندنا قورئانێڤە، برا تۆ دشێ (



٤٠ ) دەقیقاندا جوزئەکێ قورئانێ بخۆینی، ئانکۆ ختمەکا قورئانێ بکەی هەتا دووماهییا هەیڤا رەمەزانێ . شوینا تۆ ڤی دەمژمێری بکوژی ب موژیل کرنێڤە و ل رۆژا قیامەتێ حیسابا وان دەقیقان دگەل تە بهێتە کرن . بلا تۆ مفای ژ ڤی دەمژمێری بکەی و بۆ تە ببیتە بەرەڤان ل رۆژا قیامەتێ .

**پرۆژێ کلیلێن خزینا خۆدێ :**

برا تۆ دزانی کو تە ل هەیڤا رەمەزانێ (٦٠) دووعایێن قەبولکری یێن هەین، ئانکۆ تۆ دشێی (٦٠) ئاریشێن خۆ چارەسەربکەی تۆ دشێی (٦٠) خەونێن خۆ ب جهبینی، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( ولكل مسلم في كل يوم و ليلة دعوة مستجابة ) ئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری . ئەگەر زەنگین ترین مرۆڤ ل دونیایێ (٦٠) شیکێت بەنقێ بدەتە تە و بێژیتە تە بۆ خۆ بنڤێسە کا تە چەند پارە دڤێن، موسلمان دێ چەند کەیفاتە هێت – و لله المثل الأعلى – خۆدێ (٦٠) دووعایێن قەبولکری یێن داینە تە، ڤێجا تۆ خۆ قەلس نەکە ب نەکرنا دووعایان!!

**پرۆژێ حەجەکێ دگەل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن :**

پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ( عمرة في رمضان كحجة معي ) ئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری د– صحیح الجامع–دا . برا چ کار نینن مرۆڤی ب کرنا وی کاری، وەسا بهێتە حیسابکرن کو مرۆڤ

یێ دگەل پێغەمبەری سلاڤ لێ بن وەکی سەحابان، تێنەبیت عومرە د هەیڤا رەمەزانێدا .

پرۆژێ زێدەکرن و بەرفرەهکرنا رزقی :

برا تە ئاریشەکا هەی د رزقێ تە دا یان تە کارمەندیەك دڤێت یان تە ژنەك دڤێت یان تە دویندەهەکا باش دڤێت ؟ وەرە برا دا ئەز رێکێ نیشاتە بدەم . پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( من أحب أن يبسط له في رزقه وينسأ له في أثره فليصل رحمه ) ئیمامێ بوخاری و موسلم ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی . ئەو کەسێ دڤێت بەر دەستێ وی فرەهبیت ئانکۆ رزقێ وی زێدەبیت و دویندەهەکا باش پێش خۆڤە بهێلیت بلا سەرەدانا مرۆڤێن خۆ بکەت .

پرۆژێ ( ٣٠ ) قەسران ل بەهشتێ :

برا ئەڤە نە بەحسێ سیهـ قەسرانە ل بەر لێڤا ئاڤەکێ یان بەرامبەری دەریایەکی، ئەڤە بەحسێ سیهـ قەسرێن بەهشتێنە . پارێزیێ ل سەر کرنا ( ١٢ ) رەکعەتان بکە خۆدێ دێ بۆ تە قەسرەکێ ل بەهشتێ ئاڤاکەت . ئەو ژی سوننەتێن رەواتبن . ( دوو بەری نڤێژا سپێدێ، و چوار بەری نڤێژا نیڤرۆ و دوو پشتی وێ نە، و دوو پشتی نڤێژا مەغرەب، و دوو پشتی نڤێژا عەیشا ) .



پرۆژێ ( ٧ ) حەججا د رۆژێدا :

برا تۆ دزانی ئەگەر تە گوهـ ل بانگی بوو و تۆ ئێکسەر دەستنڤێژێ بگری و بچیە مزگەفتێ و نڤێژا خۆ یا فەرز ب جەماعەت بکەی خێرا تە وەکی خێرا حەججەیەکێیە، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( من خرج من بيته متطهرا إلى صلاة مكتوبة فأجره أجر الحاج المحرم ) ئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری . و هەروەسا ئەڤ چەندە بۆ ژنکێ ژی دهێت ئەگەر نڤێژا خۆ ل مالێ ژی بکەت بەلێ ئینیتاوێ ئەڤ خێرەبیت . برا ب کرنا (٥) نڤێژان د رۆژاێدا تۆ دێ خێرا (٥) حەججان ب دەستێن خۆڤە ئینی .

برا وەرە خێرا حەججەکا دی ژی ب دەستێن خۆ ڤە بینە دابنە (٦) حەجج . پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( من صلى الفجر في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ، ثم صلى ركعتين كان له كأجر حجة وعمرة تامة تامة تامة ) ئیمامێ تورمزی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی وئیمامێ ئەلبانی یا دروست کری . ئەو کەسێ نڤێژا سپێدێ ب جەماعەت بکەت ل مزکەفتێ، پشتی هینگێ بروینیتە خۆارێ و زکرێ خۆدێ بکەت هەتا هەتاڤ بهەلیت، و پشتی هینگێ دوو رەکعەتان بکەت (صلاة الضحى) دێ بۆ وی هێتە حیسابکرن ب خێرا حەججەکێ و عومرەکێ ب تەمامی ب تەمامی ب تەمامی .

و حەججا (٧)ێ یا هاتیە ڤەگۆهاستن ژ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن، ئەو کەسێ ئامادەبیت ل وانەکا زانینا دینی، خێرا وێ وەکو خێرا حەججەکێیە.{ مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ لا يُرِيدُ إِلا أَنْ يَتَعَلَّمَ خَيْرًا أَوْ يَعْلَمَهُ، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ حَاجٍّ تَامًّا حِجَّتُهُ }صححه الالباني في الترغيب والترهيب(١-١١)

**پرۆژێ ڕابوونا ب شەڤێ بۆ عیبادەتی :**

برا سەحکە ڤێ حەدیسێ، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت : ( إن الله تعالى ليمهل في شهر رمضان كل ليلة حتى إذا ذهب ثلث الليل الأول و هبط إلى السماء ثم قال هل من سائل يعطى هل من مستغفر يغفر له هل من تائب يتاب عليه ) ئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری د پەرتوکا- ظلال الجنة في تخريج السنة لابن ابي عاصم – ژمارە ٥١٣ . خۆدێ پشتی سێکا ئێکێ ژ شەڤێ دچیت د هەیڤا ڕەمەزانێدا دێ هێتە ئەسمانێ دونیایێ – هاتنەکا لائقێ مەزنییا وی عز وجل – و دێ بێژیت : ئێك هەیە هەوجەهی یەك هەیە دا ئەز بدەمێ، ئێك هەیە دووعا ژێبرنا گونەهان دکەت دا ئەز گونەهێن وی ژێببم، ئێك هەیە تەوبەبکەت دا تەوبا وی قەبول بکەم . برا ڕاستە خۆدێ هەمی شەڤێن سالێ دهێتە ئەسمانێ دونیایێ، بەلێ جیوازییا شەڤێن ڕەمەزانێ دگەل شەڤێن دی گەلەکە، شەڤێن دی خۆدێ سێکا دووماهییێ دهێتە ئەسمانێ دونیایێ، بەلێ د هەیڤا ڕەمەزانێدا پشتی سێکا ئێکێ دهێتە ئەسمانێ دونیایێ، ئانکۆ شەڤێ بکە سێ سێك



(٣/١) خۆدێ د هەمی شەڤان دا ل سێکا دووماهییێ دهێتە ئەسمانێ دونیایێ ئانکۆ سێکەکێ بتنێ، بەلێ د هەیڤا ڕەمەزانێدا پشتی سێکا ئێکێ دهێتە ئەسمانێ دونیایێ ئانکۆ سێکا دووێ و سییێ . ئەڤە ژی دەلیڤەیە بۆ مرۆڤێ موسلمان ئەوێ دڤێت ڕازیبوونا خۆدێ و بەهشتێ ب دەستێن خۆ ڤە بینیت .

**پرۆژێ شەڤا عەمری :**

شەڤا ( ليله القدر ) عیبادەتێ وێ ب خێرترە ژ عیبادەتێ هزار هەیڤان . ئانکۆ (١٢) دەمژمێر خێرترن ژ (٧٢٠.٠٠٠) دەمژمێران ئانکۆ(٣/٤ مليون دەقیقانە)!! (١)دەمژمێرێ ڤێ شەڤێ ب خێرترە ژ (٦٠.٠٠٠) دەمژمێران !!! ئانکۆ خۆاندنا ئایەتەکا قورئانێ خێرا وێ هندی خێرا (٦٠.٠٠٠) ئایەتانە، و ڕەکعەتەك هندی (٦٠.٠٠٠) ڕەکعەتانە!!! و خێرا فتارەکرنا ڕۆژی گرەکی هندی خێرا (٦٠.٠٠٠) ڕۆژی گرانە !!! ئەز ب خۆدێ کەم ئەو کەسە یێ خوسارەتە ئەوێ بهێتە بێ بارکرن ژ ڤێ خێرێ . و باشترین عیبادەت دڤێ شەڤێدا تۆ وان کەسان عەفی بکەی ئەوێن زورداری ل تەکری، و باشترین دووعا ژی ئەوە تۆ بێژی ( اللهم إنك عفو تحب العفو فاعفو عنا ) .

یارب یارب تۆ بناڤێن خۆ یێن پیروز کەی تۆ مە ژ خێرا ڤێ شەڤێ بێ بار نەکەی .

پرۆژێ زەمانكرنا رۆژییێ :

برا ئەگەر تۆ هەر رۆژ تۆ فتارێ بدەیە رۆژی گرەكی هەر وەكو تۆ وەكو وی یێ ب رۆژی، و د هەیڤا رەمەزانێدا هەر خێرەك ب دەه خێرانە، ئانكۆ ئەگەر تۆ د هەیڤا رەمەزانێدا (٣٦) مرۆڤێن رۆژی گر فتارێ بدەیێ، ئەڤە تە خێرا (٣٦٠) رۆژان بدەستێن خۆڤە ئینای. برا ژبیر نەكە كو تۆ هەردەم هندەك قەسپان یان خورمێ ببیە مزگەفتێ دا رۆژی گر فتارێ پێ بكەن، و ئەز مزگینییێ دەمە برایێ خۆ كو رۆژا قیامەتێ دێ بینی گەلەك هەیڤێن رەمەزانێ یێ د تەرازییا تەدا .

پرۆژێ بانگەوازییێ بۆ خۆدێ :

برا رەمەزان دەلیڤەیە بۆ هیدایەتا گەلەكان، تۆ ڤێ خێرا مەزن ژ دەستێن خۆ نەكە، بلا پرۆژێ تە ئەو بیت كو تۆ ڤێ رەمەزانێ دەعوا دوو برادەرێن خۆ بكەی، یان تۆ چەند (cd) یا بەلاڤكەی، یان ئەڤان لاپەرێن تۆ دخۆینی بەلاڤ بكە وهندی ئێك كاری پێ بكەت تۆ شریكێ خێرا وی .

پرۆژێ هێلانا گونەهان :

برا سوزێ بدە كو تۆ وان گونەهان بهێلی ئەوێن تە بەری رەمەزانێ دكرن وەكو جگاران و گەلەك تشتێن دی ژی، و هەروەسا مرۆڤەكێ عەرەق ڤەدخۆار بەری رەمەزانێ، رەمەزان بۆ وی دەلیڤەیە ئەوێ گونەهێ بهێلیت و بۆ خۆ دووعا ژ خۆدێ بكەت یان مرۆڤێ گەلەك غەیبەت دكر رەمەزان دەلیڤەیە بۆ وی ئەوێ



گونەهێ بهێلیت یان جحێلەك یێ موبتەلابی ب گوهدانا سترانان ئەم دێ بێژنێ رەمەزان دەلیڤەیە بۆ تە تۆ گوهدانا سترانان بهێلی .

پرۆژێ كرنا حیجابی بۆ كچێن مە موسلمانان

خۆیشكا عەزیز بلا هەیڤا رەمەزانێ ببیتە خەلەكا گوهورینێ د ژیانا تەدا، خۆیشكا عەزیز چاڤێ تە ل حیجابێ تەبیت بێ حیجاب نەدەركەڤە ژ مالا خۆ، خۆیشكێ ئەگەر تۆ نەهێیە دبن دولوڤانیا خۆدێ ڤە دەمێ هەمی دەرگەهێن بەهشتێ د ڤەكری بن و دەمێ هەمی دەرگەهێن دولوڤانییێ د ڤەكری بن و دەمێ هەمی دەرگەهێن ئەسمانی د ڤەكری بن بێژە من دێ كەنگی هێیە دبن دلوڤانییا خۆدێ ڤە . ما نە وەخت هات دا تۆ خۆ ب گوهوری .

پرۆژێ ئیعتكافێ :

برا هەولبدە كو ئەڤێ رەمەزانێ تۆ هندەك رۆژان ئیعتكافێ بكەی و تۆ دێ بینی كا دێ چەند ژیاناتە هێتە گوهورین، و دێ چەند هێتە پەروەردەكرن ژبۆ كارێن چاك .

پرۆژێ زكرێ خۆدێ :

( سبحان الله والحمد لله و لا إله إلا الله والله أكبر ... أحب الكلام إلى الله ) هەر پەیڤەك ژڤان پەیڤان ب دارەكێیە ل بەهشتێ هەر پەیڤەك ژڤان پەیڤان مەزنترە ل دەف خۆدێ ژ چیایێ ( أُحد ) و تۆ هەر پەیڤەك ژڤان پەیڤان بێژی دێ بلند بیت وچیتە دەف عەرشێ

خۆدێ ودێ بەحسێ تە هێتە کرن ل دەف خۆدێ ، برا ئەڤان پەیڤان بێژە دەمێ تۆ نڤێژا ( الضحی ) دکەی، بێژە دەمێ تۆ برێڤە دچی ، بێژە دەمێ تۆ خۆ ل هیڤیا بانگی دگری .

<u>پرۆژێ پشتی ڕەمەزانێ :</u>

برا سوزێ بدە پشتی ڕەمەزانێ تۆ عیبادەتەکی بەردەوامییێ بدەیێ وەکی ڕۆژی گرتنێ یان خۆاندنا قورئانێ یان ڕابوونا شەڤێ بۆ عیبادەتی، هەتا ئەگەر تۆ شەڤێ هەمییێ بتنێ دەمژمێرەکێ ڕابی . برا هەروەسا سوزێ بدە تۆ خۆ گوری ڤی دینی بکەی برێکا بەلاڤکرنا ڤی دینی، و ببە ئەگەرێ خێرێ ل هەمی جهان .

ئەز هیڤی دکەم ژ خۆدێ کو ڕۆژی گرتنا ڕەمەزانێ ژمە قەبول بکەت، و مە ژ ئازاکەرێن ئاگری حیسابکەت، و ڕازیبوونا خۆ ب دەستێن مە ڤە بینیت، وگوتن و کریارێن مە بۆ وەجهێ خۆ یێ پیروز حیسابکەت، و ئەز هیڤی دکەم کو خۆدێ شەڤا ( لیلة القدر ) ب رزقێ مە بکەت و ژ مە قەبولکەت ....... آمین.



# چەندین دیاردەیێن نەباش یێن کۆ دڤێت مرۆڤێ ڕۆژی گر خۆ ژێ دویر بێخیت

هندیکە هەیڤا ڕەمەزانێیە هەیڤا دلوڤانییێیە، هەیڤا خەلاتکرنێیە بۆ ئازاکرنێ ژ ئاگری، هەیڤا خێر و وبەرەکەتانە، د ڤێ هەیڤێدا گونەهـ دێ هێنە ژێبرن، و دووعا دێ بجهێن . بێگومان ئەڤێ هەیڤێ گەلەك باشی یێن دی ژی یێن هەین، بەلێ خودێ حەسبکەت مە ل بەرە ئەم بەحسێ هندەك دیاردان بکەن کو یێن ل دەڤ خەلکەکی بەلاڤ، ڤێجا یا فەرە مرۆڤ برایێ خۆیێ موسلمان لێ هشیاربکەت دا خۆ ژڤان خەلەتیان بدەتە پاش . ئەوژی ئەڤەنە :-

١- خۆ ئامادەکرنەکا نەباش بۆ ڕەمەزانێ :

هندەك ژ خەلکی خۆ ئامادە دکەن بۆ هەیڤا ڕەمەزانێ ئامادەکرنەکا نەباش، نەبەس نەباش بەلکی دگەل وێ حیکمێ ناگونجیت ئەوا د گرتنا هەیڤا ڕەمەزانێدا، دێ بینی دەمێ هەیڤا ڕەمەزانێ دەسپێدکەت خەلك چەوان ئێڤارییێن هەیڤا ڕەمەزانێ بەرەڤ بازاری دچن و دێ موژیل بن ب کرینا تشتێن خوارنێ و ڤەخوارنێڤە هەتا بانگێ مەغرەب نیزیك بیت .

و ییێ سەحکەتە سەروبەرێ خەلکی دێ بێژیت خەلك یێ بەرەڤ خەلایێ ڤە دچن، و نیزیکە کو خەلکەك دێ ژ برسا مرن ( ولا حول ولا قوة إلا بالله ) . و خوزی ئەوان ئەڤ تشتە بجهێنیاتبان بەری هەیڤا ڕەمەزانێ، دا ئەو د هەیڤا ڕەمەزانێدا بەرهەڤبان ژ بوو کرنا عیبادەتی، بەلێ ئەو کەسێ بنێریتە سەروبەرێ خەلکی دێ بێژیت کێم وکاسیەکا هەی ل دەڤ خەلکی



ژ بوو تێگەهشتنا هەیڤا ڕەمەزانێ، هەر دێ بێژی کو ڕەمەزان یاهاتیە فەرزکرن دا مرۆڤ جورێن خوارنێ بخۆت، یان مرۆڤ پارەکی بۆ خۆ کومکەت بەری هەیڤا ڕەمەزانێ و دا ڤی پارەی زەعیکەت د هەیڤا ڕەمەزانێدا، بەلێ یادورست ئەوە کو کرین دڤێ هەیڤێدا یا کێم بیت، گەلەك دەولەتێن نە موسلمان هیڤیا دکەن کو ئەوان هەیڤەك هەبا وەکی موسلمانان خەلکێ وێ ب ڕۆژی بان؛ نەبەس ژبەر لایێ ئابوری بەلکی ژبەر ساخلم بوونا لەشێ خەلکێ خۆ، و هەروەسا فێرکرنا خەلکی خۆ کو بشێن بەرسینگێ کاودانێن برساتییێ بکەن، ڤێجا دڤێت ئەم موسلمان وەسا بەرێ خۆ بدەنە هەیڤا ڕەمەزانێ کو یائێکێ عیبادەتە و ڕێکەکە ژ بوو دەستڤە ئینانا ڕازی بوونا خودێ ژ مرۆڤی و ئازاکرنێ ژ ئاگری، یا دووێ ژبەر مفایێن وێ یێن ساخلەمی و راهێنانکرنا نەفسا مە ژبەر خۆ ل بەرگرتنا شەهەواتان و هەروەسا بێهنفری ل سەر عیبادەتا خودێ .

٢- نەرماتی د کرنا هندەك گونەهاندا :

گەلەك ژ خەلکی دێ بینی د هەیڤا ڕەمەزانێدا خۆ ب هندەك گونەهانڤە مژویل دکەن و ب هێجەتا هندێ کو یێ وەختێ خۆ دبوورینین، ڤێجا دێ بینی سپێدێ هەتا نیڤا شەڤێ یێ ل پێش فلمان یان زنجیران ( الافلام والمسلسلات ) یان هەر تشتەکێ دی هەبیت ژ

پروگرامێن تەلەفزیونێ، و ئەز ب خودێ کەم ئەڤ جورە مرۆڤە یێ مسکینە وچ نزانیت ژ خەلاتێن هەیڤا رەمەزانێ، وەکو ئازاکرن ژ ئاگری، حەیف و مخابن مرۆڤێ موسلمان هەیڤا خۆ ب ڤان تشتێن بێ قیمەتڤە بورینیت، و دێ بینی مرۆڤەك یێ ل پێش تەلەفزیونێ وفلمان وزنجیران ...هتد، بەلێ مرۆڤەکێ دی یێت کەت گری و دووعا ژ خودێ دکەت کۆ وی ئازاکەت ژ ئاگری، برا تۆ خۆ ب تشتێن گوننەهەڤە موژیل دکەی و غەیری تە خۆ موژیل دکەت ب عیبادەتێ خودێ ڤە .

و هەروەسا گەلەك موسلمان تەقوا خودێ ناکەن، دێ بینی چەند مرۆڤەك یێن وەکی ئێك ل چڤاتەکی دێ روینشتینە خوارێ و رۆژا خۆ ب غەیبەتێڤە د بورینن، دێ بەحسێ مرۆڤەکێ موسلمان کەن و دێ غەیبەتا وی کەن یان ژی دێ یارێن خۆ پێ دکەن یان دێ بێ بەختیا پێڤە هێلن، و نە دویرە کۆ ئەڤ مرۆڤێ موسلمان ئەوێ بەحسێ وی دکەن وگوشتێ لەشێ وی ب خافی دخوون ل دەڤ خودێ ژوان چێتر بیت . وەسا دیارە کۆ ئەڤ جورە مرۆڤە ئەوێن ڤان گوننەهان دکەن و ل سەر هندێ را ژی ب رۆژینە، گوه ل حەدیسا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن نەبووینە وەکی دبێژیت ( مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ ) ئیمامێ بوخاری ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی ژمارە ١٧٧٠ . ئانکو: ئەوکەسێ گوتنا



درەو وکارکرنێ پێ نەهێلیت خودێ چ ئیرادە ب هێلانا وی بۆ خوارنێ وڤەخوارنێ نینە ، وگوتنا ( فليس لله حاجة ) مەجازە و رامانا وێ خودێ رۆژیا وی قەبولناکەت، و ئەڤ چەندە ژ بابەتێ هشیارکرنێیە بۆ مرۆڤێ موسلمان دانەکەڤیتە د گوننەهەکا مەزندا ئەو ژی ( قول الزور )ە . و هەروەسا پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت (لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ فَقَطْ إنَّمَا الصِّيَامُ مِنَ اللَغْوِ وَالرَّفَثِ ... )ئیمامێ بەیهەقی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی د–السنن الكبرى للبيهقي ، ٤/ ٢٧٠ –دا . ئانکو : رۆژی گرتن نە بەس هێلانا خوارنێ و ڤەخوارنێیە بەلێ رۆژی گرتن هێلانا گوتنا بێ مفا و کرێتە ( ئاخفتنا شکەستی )، و ئەگەر لەغو چێنەبیت بۆ مرۆڤێ رۆژکر، تۆ ب خودێ کەی پا غەیبەت دێ یا چەوا بیت بۆ مرۆڤێ رۆژی گر، وچ گومان د هندێدا نینە کۆ غەیبەت گوننەهەکا مەزنە . پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت ( الربا اثنان وسبعون بابا أدناها مثل إتيان الرجل أمه وإن أربى الربا استطالة الرجل في عرض أخيه ) ئیمامێ بەیهەقی و تەبرانی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی وئیمامێ ئەلبانی ئەڤ حەدیسە یا دروست کری د–السلسلة الصحيحة –دا ژمارە (١٨٧١ ).

ڕیبا حەفتێ و دوو دەرگەهن، یا ژ هەمییان کێم تر هەر وەکو زەلام بچیتە نڤینا دایکا خۆ (والعياذة بالله) و پشتی هینگێ پێغەمبەر سلاڤ لێ بن گۆت: و ڕیبا ژ

هەمییان مەزنتر مرۆڤ غەیبەتا برایێ خۆ یێ موسلمان بکەت . یا ژ من ڤە ئەڤ حەدیسە بەسە و گەلەکە بۆ مرۆڤێ موسلمان کۆ خۆ ژ ڤێ غەیبەتێ بدەتە پاش . موسلمان هشیارەبە ژ ڤێ گوننەها مەزن د هەیڤا رەمەزانێدا و پشتی رەمەزانێ ژی .

**٣- سستاتی و پویتە پێ نەکرن ب ئەرکانڤە (الواجبات) :**

گەلەك ژ رۆژی گرا د هەیڤا رەمەزانێدا سست دبن بۆ بجهئینانا عیبادەتان، دێ بینی هندەك مرۆڤێن هەین رۆژیا خۆ ب نڤستنێڤە د بورینن، ئانکۆ باراپتر ژ ئەرکان ژێ دچن وەکو نەکرنا نڤێژان ل مزگەفتێ، نەبەس ئەڤە بەلکی رۆژانە دوو یان سێ نڤێژ ژێ دچن ب ئەگەرێ نڤستنێڤە، برایێ رۆژی گر پاکانێ رۆژی گرتنا تە، کانێ پاراستنا تە ل سەر کرنا نڤێژان ل مزگەفتێ، کانێ خۆاندنا قورئانێ، کانێ زکرێ خودێ، کانێ ئیستغفارێن تە ژ گوننەهان ما مە نەگوت هەیڤا رەمەزانێ هەیڤا ژێبرنا گوننەهانە، کانێ دووعاییێن تە ژ خودێ کۆ تە ئازاکەت ژ ئاگرێ جەهننەمێ، ما نە خەلاتێ مەزن د هەیڤا رەمەزانێدا ئەوە کۆ خودێ دێ چەند مرۆڤان ئازاکەت ژ ئاگری، موسلمان بدە هزرا خۆ ئەڤە چەند هەیڤێن رەمەزانێ ل سەر تەرا بورین ؟ تۆ بێژی کۆ تە هەیڤەکێ گەلەك عیبادەت یێ کری و تە رازی بوونا خودێ ب دەستێن خۆڤە ئینایە . هزرا خۆ باش بکە د ڤێ رستێدا !!؟؟



برا دەستێن خۆ هلدە و بلا ئارمانجاتە ئەو بیت کۆ ئەڤ هەیڤە نەبوریت ئیلا تۆ عیبادەتەکێ وەسا بکەی کۆ خودێ دلوڤانییێ ب تە ببت و تە ئازاکەت ژ ئاگری . برا ب گەهە عەمرێ خۆ نە دویرە هەتا رەمەزانەکا دی تۆ بمینیە ساخ . ڤێجا ڤێ دەلیڤێ ژدەستێن خۆ نەکە، گوهێ خۆ نەدە وی هەڤالی یێ تە ب تشتەکێڤە موژیل بکەت ژ زکرێ خودێ .

**٤- هشیار بوون ب شەڤێ هەتا دەمەکێ درەنگ :**

گەلەك ژ خەلکی د مینە هشیار هەتا دەمەکێ درەنگ و ب ڤی ئەگەری نڤێژا سپێدێ ژدەستێن خۆ کەن، یان دێ مینە هشیار هەتا نڤێژا سپێدێ و ب ڤی ئەگەری دێ نڤێژا نیڤرۆ ژ دەستێن خۆ کەن، و سوننەتا پێغەمبەری سلاڤ لێ بن ئەوە کو مرۆڤ پشتی نڤێژا عەیشا ب دەمەکێ زوی بنڤیت، دا مرۆڤ رابیتە نڤێژا سپێدێ و هەروەسا نڤێژا نیڤرۆ ژ دەست نەدەت . و سەبارەت بۆ وان مرۆڤێن شەڤا خۆ ب فلمان و زنجیران ( الافلام والمسلسلات )ڤە دبورینن، یان ب گەریانا سویکێ یا ب وێ مەرەمێ بەس کو وەختێ خۆ بگوژن!! حەیف و مخابن بۆ موسلمانێ وەسا و هەر دێ بێژی ئەوی گوه لێ نە بوویە کۆ پێغەمبەری سلاڤ لێ بن یا گوتی پێ کەسەکی ژ جە نالڤیت ل رۆژا قیامەتێ هەتا پرسیار ژ بهێتە کرن کا جحیلینیا خۆ ب چڤە بوراندییە ، و مەرەم ژ ڤێ پرسیارێ ئەوە کا دەمێ ئەو جحێل ئەوی وەختێ خۆ ب چڤە بوراندییە .

٥- نەزانین ب ئەحکامێن رۆژی گرتنێڤە :

دڤێت مرۆڤێ موسلمان پێزانین ل سەر ئەحکامێن رۆژی گرتنێ هەبن، ئەو ژی ب رێکا مرۆڤێ زانا ب ئەحکامێن رۆژی گرتنێڤە، و ب راستی ئەڤ خالە گەلەکا گرنگە چونکو نە دویرە مرۆڤ بکەڤیتە هندەك خەلەتیان، و نە دویرە ئەڤ خەلەتیە وەسا بن کو رۆژییا مرۆڤێ پێ بکەڤیت، ڤێجا مرۆڤێ موسلمان دڤێت هشیار بیت ل سەر ڤێ چەندێ .

٦- ئێشاندنا نڤێژکەرا :

گەلەك موسلمان دەمێ فتارێ دکەن و پشتی هینگێ شیڤێ د خۆن دێ پیڤازان یان سیران گەل خۆن، و دەمێ دهێنە نڤێژا عەیشا و تەراویحان بهنەکا گەلەك و گەلەك نەخوش ژ دەڤێ وان دهێت، و نڤێژکەرێن ب رەخ وانڤە خودێ هاریکارێ وان بیت، نەشێن ب دروستاهی نڤێژا خۆ بکەن و سەبارەت خوشوع د نڤێژێدا هەما ب ئێك جار نا مینیت ژبەر وێ بهنا نەخوش ، و پێغەمبەری سلاڤ لێ بن نەهیا موسلمانان یاکری کو دەمێ پیڤازێ یان سیرێ دخۆن نە هێنە مزگەفتێ . و هەروەسا دەمێ بچویك دهێنە نڤێژا عەیشا و تەراویحان گەلەك شیماتیان دکەن و ب ڤێ چەندێ نڤێژکەر پێ دئێشن، ڤێجا یا فەرە کو بابێ بچویکی یان ژی برایێ بچویکی یێ مەزن دگەل بچویکی بهێتە مزگەفتێ، و ب رەخ ویڤە نڤێژێ بکەت



دا بچویك دەرفەتێ نەبینیت بۆ شیماتیان و هەروەسا دا بچویك فێری مزگەفتێ بن وکرنا نڤێژان.

٧-ژ دەست دانا شەڤێن دوماهییێ ژ رەمەزانێ :

مرۆڤ دێ گەلەك موسلمانان ل دەستپێکا هەیڤا رەمەزانێ بینیت کو گەلەك عیبادەتی دکەن بەلێ هەتا هەیڤ ب نیڤی بیت مرۆڤ وان کەسان ل مزگەفتا نابینیت، پیچپیچە دێ ژعیبادەتی ڤەبن هەتا دەه رۆژێن دوماهییێ ژ رەمەزانێ دێ بینی ئەو مرۆڤە نەشێن بۆ خۆ ب شەڤ رابنە عیبادەتی، و هەمی دزانن کو هەر دەه شەڤێن دوماهییێ ژ رەمەزانێ شەڤا ( لیلة القدر ) یا تێدا هەی، کو خێرا عیبادەتێ وێ ژ خێرا عیبادەتێ هزار هەیڤان پترە . و تایبەت جحێل مخابن ڤان شەڤان ژ دەستێن خۆ بکەن چونکو ئەوان شیان یێن هەین کو ڤان شەڤان ب شارهینین ب عیبادەتیڤە. و ئاریشا ژ هەمی مەزنتر ئەوە کو گەلەك جحێل ڤان دەه رۆژان ب گەریانێڤە د بورینن ل سویکێ ب کرینا جل و بەرگانڤە و ب راستی حەیف و مخابن بۆ وان جحێلان. گەلی موسلمانان هەیڤا رەمەزانێ دەلیڤەیە بۆ ژێبرنا گوننەهان دەلیڤەیە کو مرۆڤ تەوبەبکەت ژ گوننەهان و خۆ نیزیکی خودێ بکەت، ڤێجا بلا مرۆڤێ موسلمان خۆ ب وەستینیت دڤێ هەیڤێدا، بلا خەوا هەر دەه شەڤێن دووماهی تێنەبیت . مرۆڤ سالێ هەمی یێ نڤستیە بلا ئەڤ دەه شەڤە بۆ خودێ بن .

**٨- نەكرنا تەراویحان دگەل ئیمامی ب تەمامی :**

گەلەك نڤێژكەر دەمێ نڤێژا عەیشا دكەن دێ بینی ڕابوون ژ مزگەفتێ دەركەفتن، بێ كۆ تەراویحان دگەل ئیمامی بكەن و ئەو ب ڤێ چەندێ خۆ ژ خێرەكا مەزن بێ بار دكەن، پێغەمبەری سلاڤ لێ بن گوت : ( من قام مع إمامه حتى ينصرف ، كتب له قيام ليلة ) ئیمامێ تورمزی و ئەبو داوودی ئەڤ حەدیسە یا ڤەگۆهاستی .

ئەو كەسێ نڤێژا عەیشا و تەراویحان بكەت دگەل ئیمامی هەتا تەراویح ب دووماهی دهێن، خودێ دێ بۆ وی خێرا عیبادەتێ شەڤەكێ نڤێسیت .

**٩- قەلساتی و نەكرنا خێران :**

گەلی موسلمانان هندیكە هەیڤا ڕەمەزانێیە وەكو مە گوتی هەیڤا خێرانە، بەلێ مخابن بۆ مرۆڤێ ژێ هاتی كۆ قەلساتییێ د ڤێ هەیڤێدا بكەت ب نەكرنا خێران ل گەل فەقیر و هەژاران، ئانكۆ هەیڤ دێ ب دووماهی هێت و جارەكێ بتنێ ژی جلكەكی بۆ مرۆڤەكێ فەقیر ناكەریت، یان دەینێ هەژارەكی نادەت كۆ كەیفا وی بینیت وی ژ وێ ئاریشێ خلاس كەت، یان هەوجەهییا مرۆڤەكێ دەست تەنگ نا قەتینیت كۆ خودێ ژی ل ڕۆژا قیامەتێ دلوڤانییێ پێ ببەت سەرا وێ خێرێ .



**١٠- ڕەوشتێ نەباش :**

گەلەك موسلمان یێن هەین دەمێ برۆژی د بن ڕەوشتێ وان گەلەك نەباش د بیت، دێ بینی یێ قەسە شكەستییە وكەس نەشێت دان و ستاندێ دگەل بكەت ژبەر ڕەوشتێ وییێ نەباش، و ب ڕاستی مرۆڤێ ب ڤی ڕەنگی بیت بلا بزانیت ئەو د ئەزمونا ڕەمەزانێدا سەرنەكەت، چونكۆ ڕەمەزان مرۆڤێ ڕۆژی گر فێری بهێنفرهییێ دكەت، پێغەمبەر سلاڤ لێ بن دبێژیت (لَيْسَ الصِّيَامُ مِنَ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ فَقَطْ إنَّمَا الصِّيَامُ مِنَ اللَغْوِ وَالرَّفَثِ فَإِنْ سَابَكَ أَحَدٌ أَوْ جَهِلَ عَلَيْكَ فَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ ) ئیمامێ بەیهەقی یا ڤەگۆهاستی د- السنن الكبرى (٤ /٢٧٠) –دا ئانكو : ڕۆژی گرتن نە بەس هێلانا خوارنێ و ڤەخوارنێیە بەلێ ڕۆژی گرتن هێلانا گوتنا بێ مفا و كرێت ( ئاخفتنا شكەستی )، و ئەگەر ئێكێ گوتنەكا كرێت دەرهەقێ تەدا گوت یان ژی ژ نەزانینا خۆ زیانەك گەهاندەتە بێژێ ئەز مرۆڤەكێ ب ڕۆژی مە .

**١١- ئیسراف د خوارنێدا :**

گەلەك ژ خەلكی ئیسرافەكا زێدە دكەن د خوارنێدا، دێ بینی باراپتر ژ خوارنێ دهێتە هاڤێتن و ئەڤە ژی بێ قیمەت كرنا نعمەتێیە، و ئەز ب خودێ كەم ئەڤ نعیمەتە دێ بیتە شاهد ل سەر وان كەسان ل ڕۆژا قیامەتێ ( ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ) پاشی وێ ڕۆژێ پرسیارا هەر خێر و خوشییەكێ دێ ژهەوە ئێتەكرن .

**سوپاسی بۆ خۆدێ ، پەرتوك ب دووماهیك هات**

اللهم اجعل هذا الجهد المقل خالصا

لوجهك الكريم

وصلى الله على نبينا محمد

وعلى آله وصحبه وسلم

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين



**ناڤەرۆك**